ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە



# 101
# کۆدی ئاریۆس

نووسینی: جیهاد تربانی
وەرگێڕانی:
ئەحمەد حەمەدئەمین مەنتک

ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتی
ناوەند: زامدار قادری

بەڕێوەبەری چاپ و
بڵاوکردنەوە: ئەیاد نادر

هەولێر، بازاڕی ڕۆشنبیری، تەنیشت پارێزگا
+964 750 406 6674
ناوەندی ڕەها / Nawandi Raha

ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

# ١٠١
# کۆدی ئاریۆس

نووسینی
**جیهاد تربانی**

وەرگێڕانی
**ئەحمەد حەمەد ئەمین مەنتک**

پێداچوونەوەی
**حەیدەر ئیبراهیم**

چاپی یەکەم | ٢٠٢٠

ژمارەی بڵاوکراوە: ٤٣

ناوی کتێب: **١٠١ کۆدی ئاریۆس**

نووسینی: **جیهاد تربانی**

وەرگێڕانی: **ئەحمەد حەمەد ئەمین مەنتک**

پێداچوونە: **حەیدەر ئیبراهیم**

دیزاینی ناوەوە: **ئەیاد نادر**

دیزاینی بەرگ: **محەمەد جەبار**

ساڵی چاپ: ٢٠٢٠

تیراژ: **١٠٠٠ دانە**

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە سپاردنی ( ٤٩١ )ـی ساڵی ٢٠٢٠ـی پێدراوە.

# گەڕانەوە بۆ خاڵی سفر

نیزال باوەڕی بەوە نەدەکرد کە لە یەکێك لە کارمەندەکانی کتێبخانەی ئیسکەندەرییە بیستی، لەگەڵ عبدالعزیز گەشتێکی پڕ زەحمەتیان کرد بۆ گەیشتن بەم ساتە، گەشتێکی ترسناکی دەورەدراو بە سەختی و مەترسیی جۆراوجۆر، کە چەندین ڕۆژی خایاندووە، تیایدا گەشتیان بۆ چەندین دەوڵەت کردوو، زانیاریی مێژوویی سەرنجڕاکێشیان لە شارە جیاوازەکان کۆ کردەوە، بۆ ئەوەی بتوانن بە هۆیەوە کۆدەکانی نامەیەکی سەیر بشکێنن، کە شکاندنی پێویستی بە مەلەکردن بوو لە دەریای قووڵی مێژوودا، هەروەها پێویستی بە ئەنجامدانی کاری ترسناك و ئاڵۆز بوو لەپێناو بەستنەوەی داوە ونەکانی بەیەکتری. دوای ئەوەی لە کۆتاییدا توانییان کۆدەکانی نامە نهێنییەکە بدۆزنەوە، ئێستا بۆیان دەرکەگوت کە ماندووبوونەکەیان بەریا چوو، تاکە پیاو کە نهێنیی ئەم مەتەڵەی دەزانی کوژراوە!

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام چۆن کوشتوویانە؟ کەی ئەمە ڕوویداوە؟

- وا دیارە تۆش وەکوو هاوتەمەنەکانت بەدواداچون بۆ هەواڵەکان ناکەی، حاج متولی نزیکەی هەفتەیەك لەمەوبەر کوژراوە و، بۆ چەند ڕۆژێك هەواڵی مەرگە نادیارەکەی بووە ناونیشانی هەواڵەکان، ڕۆژنامە گەورەکان چەندین گوتاری شیکارییان بۆ لێکدانەوەی واتای ئەو نامە ژمارەییە تەرخان کرد، کە پێش مەرگی بەو خوێنەی

لە پشتی دەرۆیی لەسەر دیوارەکە نووسیبووی، پێش ئەوەی کۆتا هەناسەکانی بدات لەنزیك دیوارەکە لە خوارەوەی نامەکەی، بەتایبەت کە کوشتنی، کۆتا زنجیرەی ژمارەیەك کوشتنی نادیاربوو کە بەهەمان ڕێگە، لە شاری ئیسکەندەرییە ڕوویان دابوو. بەڵام حاجی متولی تاکە کەس بوو کە توانیبووی شتێك بەدەستە خوێنینەکانی بنووسێت، لەوانەیە هەر ئەمەش هۆکاری وەستانی ئەم تاوانانە بێت دوای کوژرانی، دوای ئەوەی تاوانبارەکان ترسان بە هۆی ئەم نامەیەوە لای پۆلیس ئاشکرابن.

- ببورە مامە، ئێمە خەڵکی میسر نین، بەیانی ئەمڕۆ گەیشتووینەتە فڕۆکەخانەی ئیسکەندەرییە، بۆیە لە ماوەی ڕابردوودا نەمان توانیوە بەدواداچوون بۆ ڕۆژنامە میسرییەکان بکەین، بەدیاریکراوی چی لەو نامە ژمارەییەدا هاتبوو کە لای لاشەکەی دۆزیتانەوە؟

- بە شێوەزارەکەتدا زانیم تۆ میسری نیت، بەڵام پێم وابوو یەکێك لە قوتابییە عەرەبەکانیت کە لە زانکۆی ئیسکەندەرییە دەخوێنن، تەنیا چەند کەسێك دەزانن نامە ژمارەییەکە چی تێدا هاتووە، بەڕێوەبەرایەتیی کتێبخانە بە فرمانی پۆلیس هەستان بە داخستنی ئەو ژوورەی حاجی متولی تیادا کوژرا. تا ئەمڕۆکەش ئەم ژوورە داخراوە، هەموو ئەوەی دەربارەی ناوەڕۆکی ئەم نامەیە دەیزانین چەند هەواڵێکی دزەپێکراوی ڕۆژنامەکانە، کە لە ڕۆژنامەیەکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، بەڵام ئەوەی من لێی دڵنیام ئەوەیە کە نامەکە

لەسەر دیوار نووسراوە و لە چەند ژمارەیەك پێكدێت، ئەمەم بەچاوانی خۆم بینی لە دوورەوە لە بەیانی ئەو شەوەی ئەم تاوانەی تیادا ئەنجام درا، بەبێ ئەوەی بتوانم ئەو ژمارانە بناسـمەوە بەهۆی دووریم و بەهۆی دەورەدانی پۆلیس بۆ شـوێنی تـاوانەكە، پێش ئەوەی بە فرمانی بەڕێوەبەری كتێبخانە ژوورەكە دابخرێت.

- نیزال بە مەراقێكی زۆرەوە پرسیی: مامە، ئەو ژمارانە چی بوون كە تۆ بینیتن؟

كارگوزارە بەتەمەنەكە بۆ سـاتێك لە قسـەكردن وەسـتا و بەگومانەوە سـەیری نیزالی دەكرد، دوای ئەوەی دركی بە گرنگیپێدانی زۆری نیزال كرد بەم چیرۆكە، پێش ئەوەی لێی بپرسێت:

- بۆچی ئەم هەموو پرسـیارە دەكەی؟ پەیوەندیت چی بوو بە حاجی متولییەوە؟ چیت لێی دەویست؟!

عبدالعزیز ئـاگـاداریی گۆڕانی دەنگی كـارگوزارەكە بوو؟ هەروەها تێبینیی بێزاربوونی هاوڕێكەی و گۆڕانی ئەدگاری ڕووخسـاری كرد، دوای ئەوەی بە پرسیارەكانی سەرنجی كارگوزارەكەی ڕاكێشا، بۆیە بڕیاری دا بچێتە ناو قسـەكانەوە بۆ ڕزگاربوون لەم هەڵوێستە، دەستی خستە سەرشانی كارگوزارەكە و پێی گوت:

- خوا لە گوناهی مردووەكەتان خۆش بێت مامە، دەزانین ئەم كاتە سەختە بۆ ئێوە، هاوڕێكەم كەسێكی زۆر فزولییە و بەهۆی ئەم كارەیەوە زۆرجار منی تووشـی كێشـە كردووە، من داوای لێبووردن

دەکەم لەجیاتی ئەو. لە ڕاســـتیدا، ئێمە بۆ گەشـــتێکی کورت هاتووینەتە وڵاتە جوانەکەتان و کاتێك هاتینە ئەســـکەندەرییە حەزمان کرد ســەردانی ئەم دامەزراوە ڕۆشـنبیرییە مەزنە بکەین، بەتایبەت کە دایکی هاوڕێکەم لەم ماوەی پێشوودا هەمیشە سەردانی ئەم شوێنەی دەکرد، هەر ئەمیش باســی حاجی متولی و باســی ئەمی بۆ کردووە بەرانبەر بە سەردانکەرانی کتێبخانە، حاجی متولی یارمەتیی دەدا لە گەڕان بەدوای ئەو پەرتوکانەی کە پێویســتی بوون، بۆیە ویســتمان ســـڵاوێکی لێبکەین و بڕێك پارەی وەکوو دیاری پێشـــکەش بکەین، پێش ئەوەی ئەم هەواڵە ناخۆشە لە تۆ ببیستین!

- واتە ئەم گەنجە فزوولییە کوڕی ئەو ئافرەتە فەڵەســتینییەیە کە هەموو ڕۆژێـــك دەهـــاتە ئێرە و تەواوی ڕۆژەکەی لە کتێـب خوێندنەوەدا بەسەر دەبرد؟

نیزال بەپەرۆشەوە وەڵامی دایەوە: بەڵێ، بەڵێ! ئەوت دەناسی مامە؟!

- لە ڕاســتیدا زۆر نەمدەناســـی، خاتوونێکی نەرمونیان بوو، هەموو بەیانییەك کە دەهات ســـڵاوی لێمان دەکرد، ئێوارانیش چەند دەقیقەیەك پێش تەواوبوونی دەوامی کتێبخانە دەڕۆشـــت و ماڵئاوایی لێمـان دەکرد. دایکـت بەپێچەوانەی تۆوە زۆر کەم دەدوا، خۆی دەپاراست لە قسەکردن لەگەڵ کارمەندانی کتێبخانە، جگە لە حاجی متولی کە هەمیشـە پەیوەندیی لەگەڵی هەبوو، دایکت هەمیشـە لە بەشی مێژووی ئایینەکان بوو کە خوالێخۆشبوو بەرپرسی بوو.

- دەتوانی ناونیشـــانی ماڵەکەیمان پێبدەی؟ ئەم پیاوە چاکەی زۆری لەگەڵ دایکم کردووە و، وەکوو کچی خۆی مامەڵەی لەگەڵ کردووە، بۆیە پێویستە سەرەخۆشی لە خانەوادەکەی بکەین و ئەو بڕە پارەیەی بڕیاربوو بیدەین بە خۆی بیدەین بە خانەوادەکەی!

- باشـــە، ئەمە بیرۆکەیەکی جوانە، حاجی متولی پیاوێکی هەژار بوو، ئەوەی من بزانم تـاکە پەیـداکەری بژێویی خێزانە گەورەکەی بوو، بۆیە هەر یـارمەتییەك لەم کـاتەدا یـارمەتیی خێزانەکەی دەدات ئەم قۆناغە سەختە تێبپەڕێنن، بەڵام لە ناونیشانەکە دڵنیا نیم، وابزانم لە نزیك مزگەگوتی ســـەرکردە ئیبراهیم دەژین، بەهەرحاڵ ناونیشـانی تەواوی کارمەندەکان لای بەڕێوەبەری کتێبخانە هەیە، کەمێك لێرە چاوەڕوانبن منیش ناونیشانەکەتان بۆ دەهێنم.

- عبدالعزیز بە ڕووی پیاوەکەدا پێکەنی و گوتی: زۆر سوپاس مـامە، من و هـاوڕێکەم لێرە چـاوەڕوانتین تـا تۆ دەگەڕێیتەوە. دوای ئەوە کارمەندی کتێبخانەکە ئەو هۆڵەی جێهێشـــت کە نیزال و عبدالعزیزی لێبوو، دوو هاوڕێکەش باســـی ئەو هەواڵە دڵتەزێنەیان دەکرد کە پێش کەمێك بیستیان.

- ئای، لەم کارەسـاتە! نیزال ببورە کە ئەم پرسـیارەت لێدەکەم، پێتوایە دایکت تا ئێستا زیندووە؟

- نیزال بەچاوی پڕ فرمێسکەوە گوتی: بەداخەوە، وا دیارە ئێمە درەنگ گەیشتووین عبدالعزیز، بەدڵنیاییەوە کوشتوویانە دوای ئەوەی

شـــوێنی لێکۆڵینەوەکەی پێگوتوون کە لای ئەم پیرەپیـاوە هەژارە حەشاری داوە.

- خودا ئارامیتان پێببەخشێت هاوڕێ، پوورە عائیشە کەسێکی چاکەکار بوو.

- ئەوەی ئێســـتا بۆ من گرنگە لە ژیانـدا تۆڵەکردنەوە لە حەشـاشـییە تازەکان و، لەناوبردنی خەونی دووبارە ڕێکخسـتنەوەی ڕێکخراوە تیرۆریســـتیەکەیانە، وەك چۆن ئەو خەونە جوانەی منیان لەناو برد کە ئەم چەند ڕۆژە کەمە هەمبوو!

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: بەڵام بۆچی پرسیاری ماڵی حاجی متولیت کرد مادام دڵنیای ئەو فایلەیان بەدەست هێناوە، کە دایکت لەلای جێهێشتبوو؟

- لەبەر چەند هۆکارێك، یەکەم، حەزدەکەم ســەرەخۆشـی لە بنەمـاڵەی ئەم پیـاوە هەژارە بکەم و ئەوەی پێویســـت بێت بۆ یارمەتیدانیان بیکەم. دووەم، دەمەوێت هەر زانیارییەکیان لێ وەربگرم کە دەربارەی دایکم دەیزانن. سـێیەم، دەمەوێت لێیان بپرسـم کە هیچ شتێك دەزانن دەربارەی ئەو ژمارانەی بکوژەکان لای تەرمەکەی جێیان هێشتبوو.

- نیزال وا دیارە وەکوو هەمیشە تۆ تەرکیزت لای قسەکانی ئەم پیاوە نەبوو، حاجی متولی بە خوێنی خۆی ئەم ژمارانەی نووســیوە نەك بکوژەکان.

- بەتەواوی تەرکیزم لەسەر قسەکانی بوو، ئەمەش دڵنیای کردمەوە کە بکوژەکان ئەم نامەیان جێهێشتووە!

عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: بەڵام چۆن؟!

- باشە عبدالعزیز، هەوڵدەدەم بەسانایی بابەتەکەت بۆ شی بکەمەوە، کاتێك لە یاریی تۆپی پێدا تووشی پێکانێکی سەخت دەبی، ئایە لەو کاتەدا ئەو شتەی بۆت گرنگە ئاماژەدانە بە ناوبژیوان بەو کەسەی بووەتە هۆی پێکانەکەت، یاخود بیر لە کەمکردنەوەی ئازاری پێکانەکەت و داوای یارمەتیکردن دەکەیتەوە؟

- لەبیرمە جارێك لە یاریی گەڕەکەکانی خریبکە و لە کاتی هەوڵدان بۆ تۆمارکردنی گۆڵا لە یاریی کۆتایی تووشی پێکانێکی ترسناك بووم و قوولەپێم شکا کاتێك لە ناوچەی سزا بەتەنیا لەگەڵا گۆڵچی مامەوە، ئەمەش کاتێك یەکێك لە بەرگریکارەکان بەخێرایی لە پشتەوە پاڵی پێوە نام، تەنیا ئەوەم لەبیرە کە لەتاو ئازار توانیم دەست بەرز بکەمەوە و داوای فریاگوزاری بکەم، ئاگام لەو شەڕ و هەرایەش نەبوو کە لە دەورم لەنێوان یاریزانەکانی دوو یانەکە ڕووی دابوو، هەروەها ناوبژیوان کۆتایی بە یارییەکە هێنابوو دوای ئەوەی هاوڕێیانی تیپەکەم ڕەتیان کردبووەوە لێدانی سزا جێبەجێ بکەن و لەسەر ئەوە سوور بوون لەو یاریزانە بدەنەوە.

- ئەمە هەستت بوو تەنیا بەهۆی شکانی قوولەپێتەوە، ئەی ئەگەر لێدانێکی بکوژیان لە پشتەوە لێدابای؟ پێتوایە حاجی متولی کات و تەرکیزی تەواوی لەبەردەست بووە بۆ نووسینی نامەیەك بە

خوێنی خۆی هەرچەندە سادەش بێت؟ ئەی ئەگەر نامەکە نامەیەکی کۆددار بێت بە ژمارە و پێویستی بە ئارامی و تەرکیزێکی زۆر بێت؟! ئەوەش بزانە مێشکی مرۆڤ بەخێرایی توانا سروشتییەکانی لەدەست دەدات لە کاتی خوێن لێڕۆیشـــتندا، ئەمەش توانای بینین و جوڵەی دەســـتەکانی ســـنووردار دەکات، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە بواری وەرگرتن و تەرکیز لای مرۆڤ بەخێرایی کەم دەکـات لەگەڵ هەر دڵۆپە خوێنێك، کە لەش لەدەستی دەدات.

- بەڵام نیزال ســـەرەڕای ئەوەی دەیلێی زۆرجار کوژراوەکان بکوژەکانیان ئاشکرا دەکەن!

- ڕاســـتە، بەڵام ئەمە بەدەگمەن ڕوودەدات، زۆرجار ئەمەش بەهۆی شتێکی بکوژەکەوە دەبێت، کە بە دەســتی کوژراوەکە دەمێنێت وەکوو پرچ، یان پارچە جلێك، هەروەها ئەم کارە پەیوەســـتە بە جۆری پێکانەکە و ڕادەی مەترســـییەکەی و ماوەی نێوان پێکان و مردن، هەروەها نابێت پاڵنەری دەروونی نادیدە بگرین کە وا لە بکوژ دەکات ناسنامەی بکوژەکەی ئاشکرا بکات، پاڵنەری دەروونی هێزێکی سەیر دەدات بە قوربانییەکە و چالاکیی زیندەیی زیاد دەکات، بەتایبەت ئەگەر ئەم پاڵنەرە ئاگادارکردنەوەی کەسانی تر بێت لە بکوژەکە.

- بەڵام بۆچی پێتوایە پـاڵنەرێکی دەروونیی گەورە نەبووەتە هۆی ئەوەی کە حـاجی متولی ئەم نـامەیە جێ بهێڵێـت بۆ ئاگادارکردنەوە لە بکوژەکان؟!

- ئەم ئەگەرەش هەیە هاوڕێ، بەڵام ئەگەر وەریشـــمان گرت، شوێنی نووسینی نامە ژمارەییەکە لەسەر دیوار وا دەکات ئەم ئەگەرە لە ڕاستیدا مەحاڵ بێت.

- پەیوەندیی شوێنی نووسینی نامەکە بەم کارەوە چییە؟!

- بـاش گوێم لێ بگرە عبـدالعزیز، ئەگەر حـاجی متولی بیویستایە بە خوێنەکەی نامەیەك بنووسێت ئەوا لەسەر زەویی ژوورەکە لەنزیك خۆی دەینووســـی، لەم ســاتانەدا مرۆڤ توانای هەڵســان و دانیشـتن و، تەنانەت بەرزکردنەوەی سـەریشـی نییە، چ بگات بەوەی نامەیەك لەسەر دیوار بنووسێت، کە پێویستی بە توانایەکی جەستەییی باش و بینینێکی تیژ هەیە.

- بەڵام کارمەندەکە گوتی دەسـتی حاجی متولییان دۆزیوەتەوە تێکەڵ بە خوێن بووە بەهۆی نووسینەوە!

- هاوڕێی شـیرینم عبدالعزیز، پێتوایە دەسـتەیەکی تاوانکار کە بتوانن تاوانێکی لەم شـێوەیە ئەنجام بدەن، ناتوانن دەسـتی کوژراوەکە بەکاربهێنن بۆ نووسینی چەند ژمارەیەك لەسەر دیوارەکە؟

- بەڵام نیزال بۆچی بکوژەکان نامەیەك جێ دەهێڵن کە لەوانەیە ناسنامەی ڕاستەقینەیان ئاشکرا بکات؟

- بەتەواوی نازانم، ســەرەتا پێویســـتە بزانم ئەم نامە ژمارەییە چی تیادا نووسراوە، بەڵام لە شتێك دڵنیام، ئەویش ئەوەیە ئەم نامەیە هەڕەشـــەیەکی ڕاســتەوخۆیە، بۆیە بکوژەکان خوێنیان بەکارهێناوە بۆ نووســـینی. لە زمانی ئاماژەدا بەکارهێنانی خوێن لە نووســـیندا

ئاماژەیە بۆ هەڕەشەیەكی ئاشكرا، بۆ ئەو كەسەی كە دانراوە نامەكە ببینێت، ئەمەش هۆكاری ئەوەیە زۆرێك لە دەوڵەتەكان ڕەنگی سوور بەكاردەهێنن لە ئاڵاكانیاندا، ڕەنگی سوور بەزۆری ئاماژەیە بە خوێن، بۆیە زیادكردنی ئەم ڕەنگە بۆ ئاڵای وڵات واتای وەفادارییە بۆ خوێنی ئەو تێكۆشەرانەی خوێنیان ڕشتووە لەپێناو نیشتیمان، بەڵام هەڕەشەیەكی پەنهانیشە بۆ هەر دەوڵەتێك بیر لە هێرشكردنە سەر ئەو دەوڵەتە بكاتەوە، بۆیە ڕەنگی سوور بەربڵاوترین ڕەنگە لەنێو ئاڵاكاندا. مرۆڤ سەرەڕای پێشكەوتنی ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ زمانی ئاماژەی سەرەتایی بەكاردەهێنن كە باب و باپیرانیان بەكاریان هێناوە.

- عبدالعزیز بەگومانەوە پرسیی: پێتوایە كە ئەم هەڕەشەیە ئاڕاستەی ئێمە كراوە؟

- تەواو دڵنیانیم، لەوانەیە ئەمە تەنیا ناكۆكیی نێوان مافیا كێبڕكێكەرەكان بێت، یان لەوانەیە نامەیەكی تەحەدی بێت لە بكوژەكانەوە بۆ ئەو لێكۆڵەرەوانەی بەدوایانەوەن، بەڵام ئەگەریشی زۆرە مەبەستی ئەم هەڕەشەیە ئێمە بین، بەتایبەت ئەگەر بكوژەكان ئاگاداری جوڵەكانی پێشترمان بووبن، واتە پێویستە لەسەرمان......

- عبدالعزیز قسەكانی پێبڕیی و گوتی: نیزال، سەیری ئەوێ بكە!

- چی بووە عبدالعزیز؟!

-         سەیری لای ڕاست بکە، چەند خولەکێکە سەیری ئەو دەرگایە دەکەم کە کارمەندەکەی لێ چووە دەرەوە، جوڵەیەکی نائاسایی ئەبینم کە بە تێپەڕبوونی کات زیاد دەکات، سات نا ساتێك کەسێك سەیرمان ئەکات و دووبارە ون دەبێت.

-         عبدالعزیز پێویستە بەخێرایی لێرە دەرچین!

عبدالعزیز و نیزال بەخێرایی بەرەو دەرگای کتێبخانەکە جولان، بەڵام ئەو کارمەندەیان لەبەر دەرگا بینی کە پێش کەمێك بینیبوویان، دەورەدرابوو بە چەند پاسەوانێك، هەرکەسێك لە کتێبخانە دەچوویە دەرەوە بە بەردەم ئەو کەسەدا تێپەڕ دەبوو ئەویش ڕووخساری دەپشکنی، پاشان ڕێگەی پێدەدرا بچێتە دەرەوە، کاتێك نیزال و عبدالعزیز ئەمەیان بینی بەخێرایی ڕێگاکەیان گۆڕی و لە دەرگاکە دوورکەوتنەوە و، هەوڵیان دا ڕێگایەکی تر بدۆزنەوە، بەڵام تێبینییان کرد پیاوێکی جل ڕەش هەنگاو بە هەنگاو بەدوایانەوە بوو، بۆیە لە هۆڵە قەرەباڵغەکەی کتێبخانەکە دەڕۆیشتن کە جمەی دەهات لە سەردانکەران، بۆ ئەوەی خۆیانی لێ بدزنەوە، پێش ئەوەی گوێیان لە دەنگێك بێت لە دواوە بڵێت:

-         ١٠١ بوەستە!

# سەرەتای چیرۆکەکە

- باش گوێبگرە، یان دان بەوەدا دەنێی کە تۆ ئەم کارەت کردووە، یان سەگێکی ڕاهێنراو دەهێنم، تاوەکوو ئەم ڕاستییەت لێ دەربهێنێت! ئەم هەڕەشەیە لە یەکێك لە ژووره تاریکەکانی لێکۆڵینەوەی تایبەت بە تاوانەکانی سیخوڕی ئاڕاستە نەکرا، ئەو کەسەش ئەم هەڕەشەیەی کرد لێکۆڵەرێکی دەزگای بەدواداچوونی فیدراڵی ئەمریکیی (ئێف بی ئای - FBI) نەبوو، ئەو کەسەش ئەم هەڕەشەیەی ئاڕاستە کرا یەکێك لە تاوانبارانی جەنگ نەبوو کە کوشتنی بەکۆمەڵیان ئەنجام دابێت، بەڵکوو ئەمە لە هۆڵێکی خوێندنی خوێندنگایەك ڕوویدا، ئەو لێکۆڵەرەش مامۆستای قوتابیانی قۆناغی سەرەتایی بوو، ئەو کەسەی ئەم تۆمەتەشی ئاڕاستەکرا کەسێکی بێتاوان بوو، منداڵێکی بێتاوان لە تەمەنێکی پاك، منداڵێك کە قوتابیی پۆلی یەکەمی سەرەتایی بوو، منداڵێك کە ڕۆژەکانی سەرەتای بوو لە یەکەم قۆناغی خوێندن لە وڵاتیك لە وڵاتانی جیهانی عەرەبی!

دڵخۆشیی نیزال بەدەوی منداڵێکی فەڵەستینی نازدار وەسف ناکرێت، ئەو بەیانییەی زوو لەخەو هەستا بۆ ئەوەی یەکەم ڕۆژی خوێندنی دەست پێ بکات لە ژیانی. لە کۆتایدا بووە قوتابی پۆلی یەکەمی سەرەتایی کە لەو کاتەی لە دایەنگا قوتابی بوو خەونی پێوە دەبینی، بەڵام ئەم دڵخۆشییە هەر زوو لەناوچوو کاتێك قوتابخانە ڕەتی کردەوە پێشوازی لێبکات لە ڕۆژی یەکەمی، ئەمەش دوای ئەوەی

ناسنامەی قوتابخانەی ون کرد لەگەڵ چوونە ناو قوتابخانەکەی، وا دیاربوو ناسنامەکەی لێکەوتبوو لە کاتی ڕاکردنی لە یەکێك لە ماموستاکان کە بە دار شوێن قوتابییەکان کەوتبوو لە مەیدانی قوتابخانە، ئەمەش وای لە نیزال کرد بۆ چەند ڕۆژێك لە ماڵەوە بمێنێتەوە و چاوەڕوان بێت بۆ تەواوکردنی ڕێکارە یاساییەکان بۆ سەرلەنوێ دەرهێنانەوەی ناسنامەیەکی تازە. دوای نزیکەی دوو هەفتە لە دەستپێکردنی ساڵی نوێی خوێندن نیزال توانیی ببێتە قوتابییەکی یاسایی قوتابخانەکەی، سەرەڕای دواکەوتنی لە هاوڕێکانی و دانیشتن بەتەنیایی لەسەر خراپترین کورسیی پۆلەکەی، بەڵام نیزال گەشبین و دڵخۆش بوو کە لە کۆتاییدا بووە قوتابی پۆلی یەکەم، پێی وابوو کە هیچ شتێکی خراپتر لەوەی ڕۆژی یەکەم هاتەڕێی تووشی نابێت، بەڵام ئەو شتەی نیزال نەیدەزانی ئەو کاتە ئەوەبوو کە شتی خراپ لە دواوەیە و هێشتا نەهاتووە!

دوای تەنیا چەند هەفتەیەك لە دەستپێکردنی ساڵی خوێندن، نیزال ڕووبەڕووی جەنگێکی سەخت بوویەوە لەلایەن یەکێك لە ماموستاکانییەوە. ئەم ماموستایە ڕەتی کردەوە کە نابێت هیچ یەك لە قوتابییەکانی پێچەوانەی فرمانەکانی بکەن بە زانینی ژمارەکانی سەرووی ژمارە ١٠٠ کە زیاترین ژمارەی ڕێگەپێدراو بوو بۆ قوتابیانی پۆلی یەکەمی سەرەتایی بەپێی بەرنامەی بڕیاردراو. قوتابییەکان دڵخۆش بوون بە دووبارەکردنەوەی ژمارەکان لە ١بۆ ١٠٠ هەموو بەیانییەك لەدوای ماموستاکەیانەوە، ماموستاش شانازیی بەوە

دەکرد کە قوتابیەکانی بەبێ دەمەقاڵێ فرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، تەنیا نیزال بێتاقەت بوو لە دووبارەکردنەوەی هەمان ژمارە هەموو ڕۆژێك!

نیزال منداڵێکی تا ڕادەیەك جیاواز بوو لە تێکڕای قوتابیەکانی تر، ئەو لەو منداڵانە نەبوو کە هەموو فرمان و ڕێنماییەك جێبەجێ بکات کە لە ناخەوە باوەڕی پێی نەبێت، هەروەها حەزی لە دووبارەکردنەوەی هەمان شت نەبوو، یاخود ئەوەی ئەوانی تر بۆی دیاری بکەن پێویستە چی فێربێت و چی فێرنەبێت، بۆیە حەزی لە وانەی بیرکاری بوو، چونکە ئازادی تێدا دەبینی و جڵەوی بۆ خەیاڵە بێسنوورەکانی دەکردەوە، بەتایبەت کە پێویستی بە لەبەرکردنێکی زۆر نەبوو کە خاڵی لاوازی بوو. نیزال بەدەست کەمیی تەرکیز و سەختیی لەبەرکردنەوە دەیناڵاند، وایلێکردبوو سادەترین شتەکان لەیاد بکات، بەڵام کارامە بوو لە وەڵامدانەوەی پرسیارە بیرکارییە سەختەکاندا، لە کاتێکدا کە قوتابیەکانی تر پێویستیان بە پێنووس و تیانووس بوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی کۆ و کەم کە مامۆستا لێی دەپرسین. نیزال وەڵامی پرسیارەکانی لە خەیاڵی خۆیدا دەدۆزیەوە بەخێراییەکی سەیر بەبێ ئەوەی پێویستی بە پێنووس و تیانووس بێت، ئەمەش وایکردبوو هەمیشە پێش قوتابیەکانی تر وەڵامی پرسیارەکانی مامۆستا بداتەوە، نیزال دەیویست بزانێت ژمارەی دوای ژمارە ١٠٠ چ ژمارەیەکە، تاوەکوو زانی ژمارە (١٠١)ە، بەیانی یەکێك لە ڕۆژەکان ئەو کاتەی قوتابیەکان وەکوو عادەتی ڕۆژانەیان لەدوای مامۆستاکەیان

ژمارەکانیان لە ژمارە ١ تاوەکوو ژمارە ١٠٠ دووبارە دەکردەوە، قوتابییەکان تووشی سەرسوڕمان بوون ئەو کاتەی بینیان نیزال بەدەوی ژمارە ١٠١ دەڵێتەوە. ئەم کارە بووە هۆی توڕەیی مامۆستاکەی کە ڕانەهاتبوو لە بیستنی دەنگێکی پێچەوانەی فرمانەکانی، هەروەها قوتابییەکانیش سەریان سوڕما لە بیستنی شتێکی تازە کە جیاواز بوو لەوەی هەمیشە لەدوای مامۆستاکەیان دووبارەیان دەکردەوە، مامۆستاکە هەستی بە مەترسی کرد لەم کارەی نیزال، بۆیە هەوڵی دا نەهێڵێت ئەم ژمارەیە دووبارە بکاتەوە لەبەردەم قوتابییەکاندا لەترسیی ئەوەی دەسەڵاتی بەسەریانەوە نەمێنێت، هەموو ڕێگاکانی گرتەبەر تاوەکوو نیزال واز لە گوتنەوەی ئەم ژمارەیە بهێنێت لەناو پۆل، هەر بۆیە لێی دا، ئاگاداری کردەوە، هەروەها بەڵێنی پێ دا بیکاتە نوێنەری قوتابخانەکەیان بۆ بەشداری لە پێشبڕکێی بیرکاری لە بەرانبەر پەیوەستبوونی بە ڕێنماییەکان، بەڵام نیزال هەموو بەیانیەك بەردەوام بوو لە گوتنەوەی ژمارە ١٠١. ئەم کارەش پاڵی بە مامۆستاکەیەوە نا تا هەوڵی شکاندنی ئیرادەی نیزال بدات و جەنگی دەروونی لەگەڵ ڕابگەیەنێت، بۆیە داوای لە قوتابییەکان کرد گاڵتەی پێبکەن و نازناوی ١٠١ی پێ دا. نیزال خەریك بوو خۆی بەدەستەوە بدات لەو جەنگە ستەمکارانەیەی لەلایەن یەکێك لە مامۆستاکانیەوە بەسەریدا سەپا، پێش ئەوەی پوورە خەدیجەی ئامۆژگاریەکی بکات کە وای لێکرد بەردەوامی بدات بەم جەنگە. دوای ئەوەی مامۆستاکەی پێیوابوو نیزال خەریکە خۆی بەدەستەوە دەدات، تووشی

ژماره ١٠١ دووباره بەیانیەك هەموو کاتێك بینی سەرسوڕمان بوو هەروەها وایلێهات گرنگی لە پێشووی، بەرزتر بە دەنگێکی دەکاتەوە بەڵکوو دەکەن، بانگی "سەد و یەك" بە قوتابیەکان نەدەدا بەوە تەنانەت داوای لە پووری بەم نازناوە دەکرد، شانازی بەپێچەوانەوە، وەرزشیەکەی جله لەسەر ژماره ١٠١ ئاڵتونی بە ڕەنگێکی کرد لەجیاتیی ئەوەی تۆپی پێ دەپۆشی. کە لە کاتی یاریی بنەخشێنێت لەکۆڵی بەدرێژایی ژیانی شەرمەزارییەك و ببێتە ژمارەیه ئەم کە زۆرێك لە هێمایەك بۆ مرۆڤدۆستی ژمارەیه بووە ئەم نەبێتەوە، سەرەڕای ترسی زۆرێك لە قوتابیەکان بە قوتابیەکان ونیان کردبوو، هاوسۆزی بۆ نیزال، بەڵام مامۆستا پشتگیریکردن و دەربڕینی هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیه کە نیزال بەوە کردبوو دەرکی ستەمکارەکەی ژماره ١٠١ بووە ئیلهام شێوازی کۆنی وانەگوتنەوەی. خاوەنی بۆ بەخشی زۆرێك لە قوتابیەکان کە پرسیاری وایان دەکرد مامۆستا پێشتر گوێی لێ نەبووبوو بپرسن، لەبەر ئەوە مامۆستا بڕیاری دا خۆی لە نیزال ڕزگار بکات لەڕێگای دانانی پیلانێك بۆی کە دەبێتە هۆی دەرکردنی لە قوتابخانە، یان لانی کەم گواستنەوەی بۆ قوتابخانەیەکی تر!

بۆیە مامۆستا پێشناری کرد بۆ قوتابیەك کە نمرەی تەواوی پێبدات لە وانەی بیرکاری بەرانبەر ئەوەی قوتابیەکە هەموو پەرتووکەکانی بیرکاری پۆلەکە بدڕێنێت جگە لە پەرتووکەکەی نیزال. پیلانی مامۆستا بەم شێوەیه بوو کە قوتابییەکە پەرتووکەکان بدڕێنێت لە

کاتی پشوو، ئەو کاتەی پۆلەکە چۆڵ دەبێت و کەسی تێدا نامێنێت، دوای ئەوە لەنێو قوتابییەکان بڵاوی بکاتەوە کە نیزال ئەم کارەی کردووە وەکوو تۆڵەکردنەوەیەك لە هاورێکانی کە گاڵتەی پێدەکەن لە وانەی بیرکاری و بە١٠١ بانگی دەکەن. ئەم پیلانە بەسەرکەوتوویی جێبەجێ کرا و دوای ئەوە ڕاستەوخۆ نیزال تۆمەتبار کرا بە ئەنجامدانی ئەم کارە، بۆیە کەوتە بەر جوێن و لێدان لەلایەن قوتابییە تووڕەکانەوە، پاشان لەلایەن بەڕێوەبەری قوتابخانەوە بانگ کرا، بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ بکەن دەربارەی دڕاندنی پەرتووکەکان. نیزال بە بەڕێوەبەری گوت ئەو پەیوەندی بە دڕاندنی کتێبەکانەوە نییە، بەڵام بەڕێوەبەر باوەڕی پێنەکرد. لەو ڕۆژەوە نیزال لەلایەن مامۆستا و دەستەی کارگێڕییەوە پاڵەپەستۆیەکی زۆری لەسەر بوو، هەموو جارێك نیزال تۆمەتەکانی ڕەت دەکردەوە و ئەوانیش هەموو جارێك هەمان تۆمەتیان ئاڕاستە دەکرد، پێش ئەوەی مامۆستایەك بانگی بکاتە پۆلەکەی و هەڕەشەی لێبکات ئەگەر دانیپێدا نەنێت، سەگی پۆلیسی بۆ دەهێنێت تاوەکوو ڕاستی لێ دەربهێنێت، نیزال بەگریانەوە وەڵامی دایەوە پێویستە ئەم کارە بکات، بەڵکوو ئەم سەگە لەو لێکۆڵینەوانەی ڕزگار بکات کە هەمیشە لەگەڵی دەکرێت. دوای ئەوەی بەڕێوەبەر و مامۆستاکان بێهیوابوون لەوەی نیزال دان بە تاوانێکدا بنێ کە لە بنەڕەتدا نەیکردبوو، دەستیان کرد بە بیرکردنەوە لە ڕێگایەکی جیاواز، لەجیاتیی ئەوەی ئەم پرسیارە لە نیزال دووبارە بکەنەوە: بۆچی پەرتووکەکانت دڕاند؟ دەستیان کرد بە پرسینی

پرسیارێکی تر، کە یارمەتیدان لە دۆزینەوەی ئەنجامدەری ڕاستەقینە، پرسیارەکە ئەمە بوو: کێ پەرتووکەکانی دڕاند؟

بەم جۆرە بەڕێوەبەر دەستی بە لێکۆڵینەوە کرد لەگەڵ تێکڕای قوتابیەکانی تر دەربارەی ئەم ڕووداوە، داواشی لە دایکان و باوکان کرد یارمەتیدەری بن لە دۆزینەوەی ئەنجامدەری ڕاستەقینە. هەندێك لە دایکان و باوکان پێیان ڕاگەیاند پێشتر یەکێك لە مامۆستاکان داوای ئەنجامدانی ئەم پیلانەی لە مندالەکانیان کردووە، بەڵام منداڵەکانیان ڕەتیان کردووەتەوە، مامۆستاکەشیان هەڕەشەی سزایەکی توندی لێکردوون ئەگەر ئەمە بە کەس ڕابگەیەنن، لە کۆتاییدا بەڕێوەبەر توانی ئەو قوتابیە بدۆزێتەوە کە ئەم کارەی ئەنجام دابوو، قوتابیەکەش بە بەڕێوەبەری ڕاگەیاند کە مامۆستای بیرکاری داوای لێکردووە بەم کارە هەستێت. بەڕێوەبەر هەستا بە ناردنی یاداشتنامەیەك بۆ وەزارەتی پەروەردە و فێرکردن، تیایدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی پێ ڕاگەیاندبوون، هەروەها باسی کێشەی نێوان نیزال و مامۆستاکەی کردبوو، وەزارەت بڕیارێکی دەرکرد بە دورخستنەوەی هەمیشەیی ئەم مامۆستا ستەمکارە لە وانەگوتنەوە، پاشان بڕیارێکی تر دەرچوو بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری دیاریکردنی ئەو ژمارانەی کە هەر پۆلێکی سەرەتایی دەبێت بیزانن، هەروەها وەزارەت خەلاتێکی سوپاس و ڕێزلێنانی بەخشییە قوتابی نیزال بەدەوی کە لەلایەن خودی وەزیری پەروەردە و فێرکردنەوە واژۆ کرابوو. بەمەش نیزال بووە بچووکترین قوتابیی وڵات کە ئەم ڕێزلێنانەی پێ بەخشرابێت لە مێژووی وڵاتدا،

دوای ئەوە بەڕێزەوە لەلایەن قوتابیانەوە بەو ژمارەیە بانگ دەکرا کە واتـای بەرهەڵســـــتی و ڕووبەڕوونەوەی دەگەیـانـد بۆ زۆرێکیـان، ژمارە١٠١ !

# هەڵاتن لە کتێبخانەی ئیسکەندەرییە

- ١٠١ بوەستە!

نیزال کەمێـك هێواش بوویەوە دوای ئەوەی گوێی لەم دەنگەبوو، ئاوڕیدایەوە بەرەو سـەرچاوەی دەنگەکە، دەنگەکە هی ئەو کەسـە جل ڕەشـە بوو کە دوایان کەوتبوو، دوای ئەوەی نیزال بیری لەوە دەکردەوە درێژە بە ڕاکردنەکەی بدات تاوەکوو بە عبدالعزیز بگاتەوە کە کەمێك لێی دورکەوتبووبوویەوە، دووبارە ئەو کەسە بانگی کردەوە:

- نیزال بەدەوی، ١٠١، ئەو سپاردەیەی کە لەپێناوی هاتبووی حاجی متولی ببینی، لای منە!

لەم کاتەدا نیزال بەتەواوی وەستا لە یەکێك لە هۆڵەکانی کتێبخانە و، بانگی عبدالعزیزی کرد تاوەکوو بگەڕێتەوە، پاشـــان ڕووی کردە ئەو پیاوە تاوەکوو پرسیاری لێ بکات:

- تۆ کێی؟ حاجی متولی دەناســی؟ ئەو ســپاردەیە چییە کە باسی دەکەی؟ پاشان چۆن ناو و نازناوی من دەزانی؟!

پیاوەکە لە ڕاکردن وەستا و بەدەم هەناسەبڕکێوە وەڵامی دایەوە:

- من سـعیدم برازای حاجی متولی، لەم کتێبخانەیە کار دەکەم لە بەشـــی پـاککردنەوە، چەنـد ڕۆژێکە چـاوەڕێی هـاتنتم، دایکە عائیشـەشت دەناسم کە بەردەوام دەهاتە ئێرە، مامە متولی پێی گوتم کە تۆ دێیت و چەند ڕۆژێك پێش کوشـتنی سـپاردەیەکی لا دانام و، پێی ڕاگەیاندم بە تۆی بدەم ئەگەر هەرشتێکی بەسەرهات.

- واتە بکوژەکان نەیانتوانیوە لەڕێی مامتەوە دەست بەسەر ئەم سپاردەیەدا بگرن؟

- بەتەواوی نا، ئەو سپاردەیەی دایکت لای جێهێشتبوو پێکهاتبوو لە لێکۆڵینەوەیەکی زانستیی گەورە، لەگەڵ پەڕێکی تر کە هەندێك شتی ئاڵۆزی لەسەر نووسراوە، بۆ پاراستنی سەلامەتیی مامە متولی، پوورە عائیشە پلانێکی دانابوو بۆ گومڕاکردنی هەرکەسێك بیر لە دەستبەسەرداگرتنی ئەم مەلەفە بکاتەوە، بۆیە دوو کۆپی لای مامم دانابوو، دانەیەکیان لێکۆڵینەوە زانستییەکە و ئەو پەڕەی لەخۆ دەگرت، دانەیەکی تریان پێکهاتبوو لە لێکۆڵینەوەکە بەبێ ئەو پەڕە، پێشی گوتبوو کە ئەو کۆپییەی پەڕەکەی لەگەڵدایە لە شوێنێکی سەلامەتدا حەشار بدات، هەروەها دوودڵ نەبێت لە پێدانی ئەو کۆپییەی کە لاپەڕەکەی لەگەڵ نییە بە هەرکەسێك کە هەڕەشە لە ژیانی بکات.

- نیزال پرسیی: من سەرم لە شتێك سوڕماوە، سەرەڕای ئەوەی دایکم بەم شێوەیە پارێزگاریی لێ کردووە، بۆچی کۆپییەکی ناتەواو، یان ساختەی جێنەهێشتوە لەجیاتیی کۆپیە ڕاستەقینەکەی، بەم شێوەیەش زەمانەتی نەگەیشتنی لێکۆڵینەوە زانستییەکە بەدەستیان دابین دەبوو تەنانەت ئەگەر شوێنی حاجی متولیشیان بدۆزیبایەوە؟!

- چی؟ خاتوو عائیشەش کۆچی دوایی کردووە؟

- بەڵێ، حەشاشییە نوێیەکان کوشتیان، ئەوانە هەمان ئەو چەتانەن کە مامتیان کوشت، بۆیە تکات لێدەکەم هەر زانیارییەك دەزانی پێم بڵێ، بۆ ئەوەی بتوانم تۆڵە لەو چەتانە بکەمەوە.

- سعید بەتووڕەییەوە گوتی: هەمان پرسیارم لە حاجی متولی کرد، پێیگوتم کە خاتوو عائیشە پێی گوتووە کە ئەم چەتانە هێندە توانا و زانیارییان هەیە کە دەتوانن هەر کۆپیەکی ساختە لە ڕاستەقینەکەی جیا بکەنەوە، هەروەها دۆزینەوەی لێکۆڵینەوەکە هیچ مەترسییەك دروست ناکات مادام دەست بەسەر لاپەڕەکەدا نەگرن، بۆیە کۆپییەکی دروستی لا جێهێشتوە، چونکە پێی وابوو ئەو کەسانەی بەدوای لێکۆڵینەوەکەدا دەگەڕێن بەسەلامەتی وازی لێدێنن دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکەیان پێدەدات، بەڵام ئەو تاوانبارانە دەستیان بەسەر کۆپیی لێکۆڵینەوەکەدا گرتووە و پاشان بەبێ هیچ بەزەییەك کوشتوویانە!

- نیزال پرسی: ئایە کۆپییەکەی تری لێکۆڵینەوەکە لێرە لای تۆیە کە لاپەڕەکەی لەگەڵە؟

- لای منە، بەڵام لێرە نییە، مامە متولی داوای لێکردم لە شوێنێکی سەلامەت حەشاری بدەم و بە تۆی بدەم لە کاتی تووشبونی بەهەر ڕووداوێکی دڵتەزێن، پێشی گوتم کە حەتمەن تۆ دێی بۆ کتێبخانە، من لە کاتی کوشتنی مامموە چاوەڕێی هاتنی تۆم، بۆیە بە بەردەوام لێرە کارم دەکرد بۆ ئەوەی لە کاتی هاتنت لێرەبم.

- زۆر سوپاست دەکەم سعید، نازانم چۆن سوپاسگوزاریم دەرببڕم بۆت و دڵتەنگم بەوەی بۆ مامت ڕوویدا، بەداخەوەم ئەو بووە قوربانیی کارێك کە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نەبوو.

- پێویست ناکات هاوڕێ، مامم زۆر حەزی دەکرد یارمەتیی دایکت بدات، دایکیشت پێی وابوو بەو پلانەی زامنی سەلامەتیی ئەوی کردووە، وەکوو ئەوەی من لە مامە متولیم بیستبێت، ئەو لێکۆڵینەوەیەی دایکت پێی هەستاوە چاکەیەکی گەورەیە بۆ مرۆڤایەتی، لەتوانایدایە مێژووی زەوی دووبارە بنووسێتەوە، بۆیە مامم ئامادە بوو گیانی خۆی لەپێناودا بکاتە قوربانی، ئێستاش دوای کوشتنی مامم لەلایەن ئەو کۆمەڵە چەتەیەوە، ئامادەم بە هەموو شێوەیەك یارمەتیتان بدەم لەپێناو تۆڵەکردنەوە بۆ مامە باشەکەم.

- بەڵێنت پێدەدەم هەموو هەوڵێکی خۆم بدەم، تاوەکوو ئەو چەتانە بە سزای شیاوی خۆیان بگەن، سعید پێم بڵێ چی دەزانی دەربارەی ئەو نامە ژمارەیەی لای تەرمەکەی دۆزییانەوە، هیچ زانیارییەکت دەربارەی هەیە؟

- مەبەستت ژمارەکانی سەر دیواری نزیك تەرمەکەیەتی؟ بینیم کاتێك بەڕێوەبەر داوای لە من و چەند هاوڕێیەکم کرد لە بەشی پاککردنەوە، کە خوێنی سەر زەوییەکە پاك بکەینەوە و، پێش ئەوەی ژوورەکە دابخرێت بە مۆبایلەکەم وێنەیەکم گرت، خەمت نەبێت هەموو ئەو زانیارییانەی دەیانزانم پێتی دەڵێم، بەڵام ئێستا نا، ئێستا کاتی

پێویستمان نییە بۆ گفتوگۆکردنی هەموو ئەو بابەتانە، پۆلیس بە ڕێگاوەن بۆ ئێرە تاوەکوو دەسگیرتان بکەن!

- چی! پۆلیس، بۆچی، چیمان کردوە تاوەکوو دەستگیرمان بکەن! ئێستا لە میسر گەیشتوین، بۆچی پۆلیس دەیەوێت دەستگیرمان بکات؟!

- باش گوێبگرە نیزال، وا دیارە پۆلیس باوەڕی وایە کە دایکت لە کوژرانی مامە متولی و کوژراوەکانی تر، کە لەو ماوەیەی پێشوو لە شاری ئیسکەندەرییە لەناو بران تێوەگلابێت، هەموو ئەو کەسانەی دایکت لە کاتی بوونی لێرە پەیوەندی لەگەڵیاندا هەبووە، بۆیە کاتێک بەڕێوەبەری کتێبخانە زانی کە لێرەی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە پۆلیسەوە کرد و، داوای کرد لە کتێبخانە بتهێڵینەوە تاوەکوو پۆلیس دەگات بەبێ ئەوەی هیچ دەنگەدەنگێك لەنێو سەردانیکەرانی کتێبخانە دروست بێت.

عبدالعزیز لەدوورەوە گوێی لە گفتوگۆی نێوان نیزال و ئەو پیاوە گرتبوو، لە هەمانکاتدا بەوردی سەیری خەڵکەکەی دەکرد نەبادا یەکێکیان هێرشبکاتە سەر هاوڕێکەی، پاشان بەو کەسەی گوت:

- گرینگ ئەوەیە ئێستا پێمان بڵێی چۆن لە کتێبخانە بچینە دەرەوە؟ عبدالعزیز بە دەنگێکی شڵەژاوەوە ئەم پرسیارەی کرد.

- ڕێگای سەرەکیی چونەدەرەوە دەورەدراوە بە پاسەوان و مەحاڵە بتوانن لەوێوە بچنە دەرەوە و، بەڕێوەبەر داوای لە کارمەندەکان کردووە

دڵنیا ببنەوە لە قوفڵدانی هەموو دەرگاکانی تر، تەنیا ڕێگایەك ماوە بتوانن لێی بچنە دەرەوە، بەڵام ڕێگایەکی پڕمەترسییە!

- نیزال گوتی: تکایە پێمان بڵێ ئەو ڕێگایە کامەیە!

- من و هاوکارەکانم ساڵانە دووجار سەربانە لێژەکەی کتێبخانە پاك دەکەینەوە، تا ئێســـتاش کلیلی ئەو ژوورەم لایە کە دەچێتەوە سەربان، دەتوانم ڕێنماییتان بکەم بەرەو ئەوێ، ئەگەر بتوانن بەهێواشی لەسەری بڕۆن لە کۆتاییدا دەگەنە گۆمەئاوێك کە دەوری کتێبخانەی داوە، تەنیا پێویســتتان بە کەمێك مەلەوانییە و، پاشـان دەگەنە سـەر ڕێگای گشـــتی و، بە تێپەڕاندنی دەگەنە کەناری ئارامی لەســەر کەنارەکانی دەریای سپیی ناوەڕاست بەدوور لە چاوی ئەو کەسانەی بەدواتاندا دەگەڕێن، بەڵام مەترسـییەکە لەوەدایە سـەربانەکە زۆر لێژە و، هەر جوڵەیەکی بێ بەرنامە دەبێتە هۆی خزینتان و مردنتان، یان لە باشـــترین باردا دەبێتە هۆی شـــکانێکی مەترســـیدار، یەکێك لە هاوکارەکانم چەند مانگێکە بەدەســت شـکانی پشـتیەوە دەناڵێنێت لە ئەنجامی خزانی لە کاتی پاککردنەوەی ســـەربانەکە، بەداخەوە من نـاتوانم یـاوەریتـان بکەم بۆ ئەوێ، چونکە دەبێـت چونەدەرەوەم لە کتێبخانە تۆمار بکەم بەشێوەیەکی یاسایی تاوەکوو گومانم لێنەکەن و تەواوی کارەکە ئاشـــکرابکەن، بۆیە من لە دەرگای ســـەرەکییەوە بەشـــێوەیەکی ئاســـایی دەچمە دەرەوە و لە کەناری دەریا بەرانبەر کتێبخانە چاوەڕوانتان دەبم، لەوێ زانیارییەکانتان پێدەدەم.

- ڕێگایەکی ترمان نییە سعید، ئێمە کاتێکی زۆرمان لەبەردەست نییە لە لێکۆڵینەوەدا بەسەری ببەین تاوەکوو بێتاوانیی دایکم بسەلمێت لەو تاوانانە، کارێکی گرینگمان لەبەردەستە کە دەبێت بەزوگوتریت کات جێبەجێی بکەین، تکایە ئەو دەرگایەمان پیشان بدە کە دەمانبات بەرەو سەربانی کتێبخانە.

- زۆرباشە، بەئارامی شوێنم بکەون!

نیزال و عبدالعزیز شوێن سعید کەوتن کە لە هۆڵێکەوە دەچووە هۆڵێکی تری خوێندنەوە، تاوەکوو گەیشتنە هۆڵی خوێندنەوەی سەرەوە، کە دەرگای چونە سەربانی لێبوو، سعید لەپشت کۆمەڵێك کتێبەوە وەستا و سەیری نیزال و عبدالعزیزی کرد و بەچرپە پێی گوتن:

- هۆڵەکە پڕە لە خوێنەر و پاسەوان و، ئارامی باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشاوە، بۆیە هەر جوڵەیەك لە هۆڵەکە پاسەوانەکان هەستی پێدەکەن.

- نیزال گوتی: سعید، کەوایە پێویستە چیبکەین؟

- ئەم کلیلە بگرە نیزال، ئەو دەرگایەی بەرانبەرمان دەبینی؟ ئەوە دەرگای چوونە سەربانە، لێرە بوەستن و مەجوڵێن تاوەکوو زەنگی ئاگرکەگوتنەوە لێدەدەم، کە دەکەوێتە لای ڕاستی هۆڵەکە، لە کاتی لێدانی زەنگی ئاگادارکردنەوە شلۆقی لە هۆڵەکە بڵاو دەبێتەوە و، لەو کاتەدا بەخێرایی بەرەو دەرگاکە بجوڵێن و لەوێشەوە بەرەو سەربان بڕۆن.

سـعيد بەئارامی بەرەو لای ڕاسـتی هۆڵەکە ڕۆیی و، نیزال و عبدالعزیز چاودێرییان دەکرد، سعید زەنگی ئاگادارکردنەوەی داگرت، بەڵام هیچ ڕووینەدا، سـعید چەندجارێك هەمان کاری دووبارەکردەوە بەبێ ئەوەی هیچ دەنگێك لە هۆڵەکە دەربچێت، سعید سەیری نیزال و عبدالعزیزی کرد و بەدڵتەنگییەوە سـەری دەجولاند، دوو هاوڕێکە لە هۆکاری لێنەدانی زەنگەکە تێنەگەیشتن، ئایە بەڕێوەبەر لە کاری خستووە لەترسـیی بەکارهێنانی بۆ ڕاکردن، یاخود لە بنەڕەتدا زەنگەکانی ئاگادارکردنەوەی کتێبخانەکە کارناکەن؟ لە کاتێکدا نیزال حەپەسـابوو بەهۆی ئەم ڕووداوە چاوەڕواننەکراوە، عبدالعزیز بەرەو ناوەڕاستی هۆڵەکە ڕۆیی کە دەیان خوێنەر بەئارامی دانیشتبوون.

- بۆ کوێ شـێتە؟ کارەکەمان ئاشـکرا دەکەی! نیزال بەچرپەوە بانگی عبدالعزیزی کرد.

بەڵام عبدالعزیز گرینگی بە نیزال نەدا و بەردەوام بوو لە ڕۆیشـتن تا گەیشـتە ناوەڕاسـتی هۆڵەکە، لە کاتێکدا نیزال و سـعید بەسـەرسـوڕمانەوە شـوێنی کەوتبوون، عبدالعزیز لەسـەر یەکێك لە کورسییەکان دانیشت، پاشان بەخێرایی هەستا و هاوارێکی کرد کە لە هۆڵەکە دەنگی دایەوە:

- بۆمب! بۆمب! خۆتان ڕزگاربکەن!

هەرکە عبدالعزیز هـاواری کرد، هەموو خوێنەرەکـان بەخێرایی لە شـوێنەکانیان هەسـتان و هاواریان دەکرد و بە هەموو لایەکدا ڕایان دەکرد، شـلۆقی لە تەواوی هۆڵەکە بڵاوبویەوە و، پاسـەوانەکان بەرەو

پلەکان چوون تاوەکوو ڕێگری بکەن لەوەی خەڵکی بەســـەر یەکتریدا بکەون، لە کاتێکدا نیزال ســەیری ئەم دیمەنە دراماتیکییەی دەکرد و مێشکی کاری نەدەکرد لە گەورەیی ئەو کارەی هاوڕێکەی کردی.

- دەی نیزال، بجوڵێ! عبـدالعزیز هـاواری کرد لە کـاتێکـدا دەستی نیزالی گرتبوو.

دوو هاوڕێکە بەخێرایی ڕۆیشتن تاوەکوو گەیشتنە دەرگای سەربانەکە و، دەرگاکەیان کردەوە بەو کلیلەی سعید پێی دان و گەیشتنە سەربانە لێژەکەی کتێبخانە.

- ئاگاداری هەنگاوەکانت بە نیزال، سەربانەکە زۆر لێژە.

- عبدالعزیز پێم وایە ڕۆیشـتن لەسـەر ئەم سـەربانە لێژە، جگە لەوەی مەترسـیدارە، زۆر هێواشـیشـە، کارەکەمان ئاشـکرا دەبێت پێش ئەوەی بگەینە کۆتایی، بۆیە پێویســـتە لەســـەری بخزین لەجیاتی ڕۆیشتن لەسەری!

- چی؟ لەسەر سەربانەکە بخزین؟ بەڵام چۆن؟



- سەیری ئەو کارتۆنە بۆشانەی لای دەرگاکە بکە، یەکێك لە کارتۆنەکان بهێنە و، لەسەر چۆکەکانت لەسەری دابنیشە، سەرت بەرزبکەرەوە و پشت بە دەستەکانت ببەستە، ڕێڕەوێکی باش هەڵبژێرە بۆ خزین تاوەکوو بەر پەنجەرەکان نەکەوی، منیش هەمان کار دەکەم، تا سێ دەژمێرم و دەردەچین!

دوای ئەوەی دوو هاوڕێکە ئامادە بوون بۆ خزین، نیزال دەستی بە ژماردن کرد:

- یەك، دوو، سێ ..... دەرچۆ! نیزال بە دەنگێکی پڕ لە تامەزرۆیەوە هاواری کرد.

نیزال بەخێرایی لەسەربانی کتێبخانەی ئیسکەندەرییە دەستی بە خزین کرد، لەپاڵیشیدا کەمێك دوای ئەو عبدالعزیز دەستی بە خزین کرد، خێرایی دوو هاوڕێکە زیادی دەکرد لە هەر چرکەیەك کە لە کۆتایی سەربانەکە نزیك دەکەوتنەوە، عبدالعزیز لە خۆشیدا هاواری دەکرد، بەڵام نیزال بێدەنگ بوو.

- عبدالعزیز لە کاتێکدا بەخێرایی دەخزی و پێدەکەنی پرسی: چۆن ئەم بیرۆکە شێتانەت بە خەیاڵدا هات؟

- لە شوێنکەوتنی پشیلەکانەوە فێری بووم!

- چی دەڵێی؟ باش گوێم لێ نەبوو!

- نیزال بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوە و چاوەکانی داخستبوون وەکوو ئەوەی شتێکی بێتەوە یاد: لە پشیلەکان!

# پشیلەکان

نیزال منداڵێکی سەیر بوو، کۆمەڵێک هیوایەتی نامۆی هەبوو، یەکێک لەم هیوایەتانەشی شوێنکەوتنی ئاژەڵە بێلانەکان بوو، بۆیە شوێنی سەگ و پشیلەی سەرشەقامەکان دەکەوت تاوەکوو شوێنی خۆحەشاردانیانی ئەدۆزییەوە، سەرەتا شوێنی پشیلەکان دەکەوت و، جێژێکی زۆری لەم کارە دەبینی لە شوێنکەوتنیان لەناو کەلاوەکان و ژێرزەمینە تاریکەکان، لە میانەی شوێنکەوتنی گیانەوەران لە سەردەمی منداڵی فێری هونەرەکانی گەڕان و چاودێری و خۆحەشاردان بوو، هەروەها فێری ئارامگری بوو، نیزال شوێن پشیلەکان دەکەوت بەبێ ئەوەی هەستی پێبکەن، بۆیە هەندێک جار چەند کاتژمێرێک دەڕۆیی تەنها لەپێناو دۆزینەوەی شوێنی نیشتەجێبوونی پشیلەیەك، هەر بۆیە خۆی لەژێر ئۆتۆمبێلە تێکچووەکان دەشاردەوە و بە دیوارە بەرزەکاندا سەردەکەوت و، لەنێوان باڵەخانە بەرزەکاندا بازی دەدا و، لە سەربانە لێژەکاندا دەخزی، لە هەمانکاتدا نیزال زۆر شت لە پشیلەکانەوە فێربوو، بەتایبەت لە هونەری مانەوە، کە پشیلەکان مامۆستای ئەم بابەتەن، بۆیە ئەو بەباشی لەو گوتە باوەی نێو خەڵکی تێدەگەیشت کە دەڵێن: پشیلە حەوت ڕۆحی هەیە، لەڕاستیدا پشیلە یەك ڕۆحی هەیە، بەڵام بەوە لە گیانلەبەرەکانی تر جیادەکرێتەوە کە توانایەکی گەورەی هەیە لە پاراستنی ئەو ڕۆحەی، نەك لەبەر ئەوەی ئەو سەختی و دژوارییانەی دێنە ڕێگای کەمترە لە گیانەوەرانی تر، بەڵکوو لەبەر ئەوەی

توانایەکی زگماکی هەیە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ئەو سەختییانە، بۆ نموونە پشـــیلەکان توانایەکی گەورەیان هەیە لە بینین لە تاریکیدا کە بە دەیان جار لەســـەرووی بینینی مرۆڤەوەیە، هەروەها پشـــیلەکان توانایەکی گەورەیان هەیە لە خۆفڕێدان لە شـــوێنە بەرزەکان بەبێ ئەوەی ئازاریان پێبگات، کاتێك پشیلەیەك باز دەدات، یان خۆی فڕێ دەدات لە شـــوێنێکی بەرزەوە، توانای بینینە بەرزەکەی بەکاردەهێنێت بۆ دیاریکردنی ئەو ماوەیەی ماوە بگاتە زەوی یاخود ســـیســـتەمی هاوســـەنگی (کە لە گوێی ناوەوەی پشـــیلە و زۆرێك لە شـــیردەرەکان هەیە) بەکار دەهێنێت، پاشـــان خۆی لول دەدات بەشـــێوەیەك بکەوێتە ســـەر قاچەکانی لەجیاتیی کەوتن بەســـەر پشـــت یان ســـەریدا، ئەم جوڵەیەش زانســـتییانە پێی دەگوترێت (کاردانەوەی خۆڕاســـتکردنەوەی پشـــیلەکان - cat righting reflex)، نیزال زۆرجار ســـوودی لەم جیاکەرەوە ســـەیرەی پشـــیلە بینیوە لە ژیانیدا، لە کاتی تێڕامانی کەوتنی پشـــیلەکان لەوە تێگەیشـــت، ترس لە کەوتنی مرۆڤەکان نییە، چونکە هەموو مرۆڤێك ئەگەری ئەوەی هەیە لە یەکێك لە ئەزموونە زۆرەکانی ژیانیدا بکەوێت، بەڵکوو مەترسی لە چۆنیەتیی مامەڵەی مرۆڤەکانە لەگەڵ ئەو کەوتنە، یان بڕیار دەدات هەستێتەوە و درێژە بە ڕێگای ڕۆیشـــتنی دەدات و، دووبارە هەوڵ دەدات، یان خۆبەدەســـتەوە دەدا بۆ ئەوەی ئەم کەوتنە وێرانی بکات، لەناوی ببات و، بۆ هەمیشە کۆتایی پێبهێنێت، نیزال بەدرێژاییی ژیانی ئەم وانەیە لە پشیلەکانەوە فێر بوو:

"کەوتن لە خودی خۆیدا کارەسات نییە،

بەڵکوو کارەسات ئەوەیە ڕێگە بدەیت ئەو کەوتنە لەناوت ببات."

## نامە ژمارەییەکە

- نیزال لە مۆبایلەکەی سعید سەیری نامە ژمارەییەکەی کرد و گوتی: وەکوو چاوەڕوانم دەکرد ئەوە نامەیەکی هەڕەشە ئامێزە لەلایەن ئەو چەتانەوە کە حاجی متولییان کوشت.

- سعید کە لەگەڵ نیزال و عبدالعزیز لە کەناراوەکانی ئیسکەندەرییە دەگەڕا، وەڵامی نیزالی دایەوە: چی؟ بەڵام ئەوانە تەنیا ژمارەی سادەن کە هیچ واتایەکیان نییە، پاشان مامم خۆی ئەو ژمارانەی بە خوێنی خۆی نووسیوە پێش ئەوەی کۆتا هەناسەکانی بدات!

- نەخێر، سعید، ئەوە نامەیەکی هەڕەشەی ڕاستەوخۆیە لەلایەن ئەو چەتانەوە کە مامتیان کوشت.

- هەڕەشە لە کێ بەدیاریکراوی؟

- هەڕەشەیە لە من بەدیاریکراوی! نیزال وەڵامی دایەوە.

- سعید بەسەرسوڕمانەوە پرسیاری کرد: بەڵام چۆن ئەوەت زانی تەنیا لە کۆمەڵێك ژمارەی سادەوە؟!

- زۆرباشە، بەجوانی لە ژمارانە وردبەرەوە، ئەم ژمارانە بەشێکن لە (بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناچی )!

- سـعید قسـەکانی پێبڕی و گوتی: مەبەسـتت (لیۆناردۆ فیبۆناچی ) یە، بیرکاریزانی گەورەی ئیتالی؟

نیزال قسـەکانی بڕی و بەسـەرسـوڕمانەوە سـەیری سـعیدی کرد، عبدالعزیزیش هەمان کاری کرد، سعید لە نهێنیی سەرسوڕمانەکەیان تێگەیشت، بۆیە بەزەردەخەنەوە گوتی:

- سـەرتان سـوڕنەمێنێت، کە پاککەرەوەیەکی سـادە ئەم شـتانە بزانێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان منیش قوتابیەکی زیرەك بووم لە قوتابخانە و، هەر لە منداڵیەوە حەزم لە خوێندنەوە و زانینە و، منیش وەکوو هەر منداڵێکی تر خەونم بۆ داهاتووی خۆم هەبوو، خەونی من ئەوە بوو ببمە ئەندازیارێکی دەریایی، تاوەکوو شـارەکەم ئیسـکەندەرییە بەرەو پێشـەوە ببەم، بەڵام بارودۆخی سـەختی ژیان، من و زۆرێك لە هاوتەمەنەکانمی ناچار کرد واز لە خوێندن بهێنین، بۆیە لە کۆتا سـاڵی خوێندنم وازم لە خوێندن هێنا، توانام نەبوو پارەی وانە تایبەتییەکان بدەم وەکوو باقی قوتابییەکانی تر، بەنیسـبەت ئێمەشـەوە مەحاڵ بوو سەرکەتوو بین و نمرەی بەرز بەدەست بهێنین لە خوێندنی ئامادەیی، بەبێ ئەوەی وانەی تایبەتی وەربگرین، کە تێچوویەکی زۆری هەبوو، خێزانە هەژارەکانی وەکوو خێزانی ئێمە ئەو توانایەمان نەبوو، بۆیە ڕێگاکەم کورت کردەوە، وازم لە خوێندن هێنا و دەستم بە کارکردن کرد لە بەندەری ئیسکەندەرییە بۆ ئەوەی یارمەتیی خێزانەکەم بدەم، بەتایبەت دوای ئەوەی باوکە بەتەمەنەکەم تووشـی پێکان بوو لە پشتیدا لە ئەنجامی هەڵگرتنی باری قورسەوە، کە وەکوو کۆڵکێش لە

بەندەر کاری دەکرد، بۆیە لەجیاتیی ئەوەی وەکوو ئەندازیاری دەریایی لە بەندەری ئیسکەندەرییە کار بکەم وەکوو خەونم پێوە دەدی، لە باوکمەوە پیشەی کۆڵکێشیم بۆ مایەوە، لەوانەیە منیش لە داهاتوو بۆ منالەکانمی جێبهێڵم، لەم شارە کارەکان بەم شێوەیە دەڕۆن، ئەگەر منداڵی کەسێکی دەوڵەمەند یاخود بەرپرس نەبیت، زۆر سەختە خەونەکانت بەدی بێن!

- خەم مەخۆ سعید، تۆ هێشتا گەنجیت، داهاتووت لە پێشە، دەتوانی لە هەمان کاتدا کار بکەیت و بشخوێنیت.

- بیرم لەم کارە کردووەتەوە، بەڵام کارکردنم وەکوو کۆڵکێش بەس نییە بۆ ئەوەی پێداویستییەکانی خێزانەکەم دابین بکەم و دەرمانەکانی باوکە نەخۆشەکەم بکڕم، بۆیە بەیەکجاری وازم لە بیرۆکەی خوێندن هێنا، بەدوای کارێکدا گەڕام بۆ بەیانیان، کە لەو کاتەدا لە بەندەر کارناکەین، زۆر دڵخۆش بووم کاتێك مامە متولیم کارێکی بۆ دۆزیمەوە لە کتێبخانەی ئیسکەندەرییە وەکوو کارمەندی پاککردنەوە، لەبەر ئەوەی خۆشەویستییەکی زۆرم بۆ خوێندنەوە و فێربون هەبوو کارکردنم لە کتێبخانە هەلی خوێندنەوەی دەیان کتێبی بۆ ڕەخساندم لە کاتی پشووەکانمدا، یەکێك لەو کتێبانەی خوێندمەوە و چێژێکی زۆرم لێبینی کتێبە بەناوبانگەکەی لیۆناردۆ فیبۆناچی بوو بەناوی "کتێبی ئەژمارکردن"، ئەم کتێبە بۆ من.......

بەم شێوەیە سعید درێژەی بە قسەکانی دا تاوەکوو عبدالعزیز قسەکانی پێبڕی و گوتی:

- ببورە سەعید، چیرۆکی هەوڵدانەکانت زۆر سەرنجڕاکێشە، بەڵام وەکوو دەزانی ئێمە لە پاڵتا دەڕۆین و جلەکانمان بەتەواوی تەڕن، دوای ئەوەی بەپێی ئەو پلانە زیرەکانەی جەنابت لەو گۆمە دەستکردەی دەوری کتێبخانە مەلەمان کرد، وەکوو دەشزانی پۆلیس بەدوامانددا دەگەڕێت، بۆیە باشترە واز لە گێڕانەوەی چیرۆکی ژیانت بهێنیت بۆمان و لەجیاتیی ئەوە سپاردەکەمان پێبدەی تاوەکوو بتوانین گەشت بکەین پێش ئەوەی پۆلیس دەستبەسەرمان بکات!

- نیزال ئەو کەسە شێتە کێیە لەگەڵت؟ مامە متولی هیچی دەربارەی پێنە گوتووم؟ سعید پرسیاری کرد و ئاماژەی بۆ عبدالعزیز کرد بەتووڕەییەوە.

نیزال پێکەنی و وەڵامی سعیدی دایەوە:

- ئەمە هاوڕێ مەغریبییەکەم عبدالعزیزە، کەسێکی زۆر باشە، بەڵام زمانی کەمێك توندە.

- مەغریبی؟ بەخێربێیت بۆ میسر، بەدڵنیاییەوە گۆڵە جوانەکەی محمد ئەبو تریکەت لە بیرە کە لە یانەی فاسی مەغریبی تۆماری کرد؟ سعید بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕییەوە پرسی.

- ئەبو تریکە یاریزانێکی ڕەوشتبەرزە و ئێمە لە مەغریب زۆرمان خۆشدەوێت، گۆڵەکەشی زۆر جوان بوو، بەڵام بەقەد گۆڵەکەی موستەفا حاجی جوان نەبوو کە لە هەڵبژاردەکەتانی تۆمار کرد لە پاڵەوانێتیی جامی نەتەوەکانی ئەفریقا لەساڵی ١٩٩٨ز،

بەدڵنیاییەوە تۆ ئەو گۆڵە و ئەو یاریەت باش لەبیرە کە تیایدا شکستتان هێنا؟

- نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و بە سەعیدی گوت: من لە تووندی زمانی ئاگادارم نەکردیتەوە؟

- نیزال واز لە زمانی من بهێنە و پێم بڵێ، ئەو زانا ئیتالییە هەمان کەس نییە کە بۆت باسکردم لە میانەی گەشتەکەمان لە "کۆدی بەربەرۆسا"؟ هیچ شتێکم دەربارەی ئەو لەیاد نەماوە، بەحاڵ ناویم لەیادماوە!



- بەڵێ، ئەوە هەمان کەسە، (لیۆناردۆ فیبۆناچی - Leonardo Fibonacci) یەکێک لە بەناوبانگترین بیرکاریزانەکانی مێژووی مرۆڤایەتی ئەم زانایەیە، ڕێڕەوی مێژووی لە خۆرئاوا و خۆرهەڵاتی زەوی گۆڕیی دوای ئەوەی ئەو ژمارانەی گواستەوە بۆ ئەورووپا کە شارستانیەتی ئەورووپی سەردەمی لەسەر بنیاد نراوە، ئەم ژمارانە ناسراون بە (ژمارە عەرەبییەکان - Arabic Numerals)، سەرەڕای ئەوەی ئەم زانا گەورە ئیتالییە لە شاری

بیزای ئیتالی له ساڵی ۱۱۷۰ز له دایك بووه، بەڵام بەشێکی زۆری ژیانی لەشاری بجایەی جەزائیری بەسەربردووه، که وەکو زۆربەی شاره ئیسلامیەکانی تر له زانسته تاقیکاریەکانی سەردەم پێشکەوتو بوو، لەم شاره جەزائیریه و لەسەردەستی کۆمەڵێك زانای گەورەی مسولْمان فێری زانست بووه که لەم شاره ژیاون، وەکوو عبدالحق الاشبیلی و ابن حمد و زانای ناوداری ناسراو به سیدی بومدین و، ابی حمید الصغیر، هەروەها به یاوەری باوکی که بەرپرسی بازرگانیی نێوان بیزا و باکووری ئەفریقا بوو، نێوان شارەکانی توونس و مەغریب و جەزائیر گەڕاوه، لەو ماوەیەدا بیرۆکەی پەرتووکه ناودارەکەی لا گەڵاڵه بوو که شۆڕشێکی فیکریی گەورەی له ئەورووپا بەرپا کرد له کاتی بڵاوبوونەوەی بەناوی، (لیبر ئاباچی - Liber Abaci).




لەم کتێبەدا بەئاشکرا کاریگەربونی فیبۆناچی به زانستی مسولْمانان دەبینرێت، بەشێوەیەك که بەشێکی کتێبەکەی له ڕاستەوه بۆ چەپ دەرکرد وەکو کتێبه عەرەبیەکان، لەڕێگای ئەم کتێبەوه فیبۆناچی سیستەمی ژمێرکاریی پێشکەوتوی مسولْمانانی به ئەورووپا ئاشنا کرد، ئەم کاره وەکو شۆکێك بوو بۆ ئەورووپیەکان که له تاریکیی

سەدەکانی ناوەراست گینگڵیان دەدا، لەم کاتەوە ژمارە عەرەبییەکان کە مسوڵمانان لە هیندییەکانەوە پەرەیان پێدابوو شوێنی ژمارە ڕۆمانییە ئاڵۆزەکانی گرتەوە، کە بووبووە بەربەستێک لەبەردەم پێشکەوتنی ئەورووپا، تا ئەمڕۆکەش ئەم ژمارانە لەتەواوی مامەڵە بازرگانییەکان و لێکۆڵینەوە زانستییەکان و کاروباری ڕۆژانەی خەڵکی بەکاردەهێنرێت.

# Arabic numerals

# 0123456789

- هەموو ئەوانەی باسی دەکەی شتی جوانن، بەڵام تکات لێدەکەم ڕاستەوخۆ برۆ ناو بابەتەکەوە، پەیوەندیی ئەم زانایە بەم ژمارانەوە چییە؟! عبدالعزیز پرسی.

- عبدالعزیز ئەوەت لەبیرنەماوە کە پێشتر بۆم باسکردی دەربارەی "بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناچی "؟

- تەنیا ئەوەم لەبیرە ئەو ژمارانە بە ڕێگایەکی دیاریکراو ڕێکخراون، بەڵام چۆنیەتیی ئەو ڕێکخستنەم لەیاد نییە!

- بەدوایەکداهاتن هەروەها پێشـــی دەگوترێت زنجیرەیی یان هاورێژەیی، بریتییە لە کۆمەڵێك پێکهاتەی ڕیزکراو بەشـــێوەیەکی دیاریکراوی واتادار، بەشـــێوەیەك کە هەر پێکهاتەیەك پەیوەندی بە پێکهاتەکەی دوای خۆیەوە هەیە و بەشـــێوازێکی دیاریکراو پێیەوە گرێ دراوە، (بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناچی - Fibonacci Sequence) نموونەیەکن لەســـەر ئەوە، فیبۆنـاچی لە بەدوایەکداهاتنەکەی ژمارەکانی بەشـــێوەیەك ڕیز کردووە کە هەر ژمارەیەك دەکاتە کۆی دوو ژمارەی پێش خۆی، ئەگەر وادابنێین کە ژمارەی یەکەم ژمارە ١، ئەو کات ژمارەی دووەمیش هەر دەکاتەوە ١، چونکە کۆی دوو ژمـارەی پێش خۆیەتی کە ١و٠، هەروەهـا ژمارەی ســـێیەمیش دەکاتە دوو، چونکە کۆی دوو ژمارەی پێش خۆیەتی کە ١و١، بەم شێوەیە زنجیرەکە بەردەوام دەبێت، هەر ژمارەیەك کـــۆی دوو ژمـــارەی پـــێـــش خۆیەتی: ٠،١،١،٣،٥،٨،١٣،٢١،٣٤،٥٥،٨٩،١٤٤ ئەم ســـیســـتەمە بەردەوام دەبێت تاوەکوو ناکۆتا.

**The Fibonacci Sequence**

**1,1,2,3,5,8,13,21,34,55,89,144,233,377...**

| | |
|---|---|
| 1+1=2 | 13+21=34 |
| 1+2=3 | 21+34=55 |
| 2+3=5 | 34+55=89 |
| 3+5=8 | 55+89=144 |
| 5+8=13 | 89+144=233 |
| 8+13=21 | 144+233=377 |

- بەڵام نیزال ئەو کاتە ئەو ژمارانەی لای تەرمی مامە متولیم دۆزراونەتەوە ناتەواون و نابێتە بەشێك لە بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناچی ، ژمارە "١" کەمە، ژمارەکان پێویستە بەم شێوەیە بن تاوەکو ببنە بەدوایەکداهاتنەکانی فیبۆناچی ٠١١٢٣!

- قسەکانت ڕاستن عبدالعزیز، ژمارەیەك کەمە، واتە نامەکە لە خودی خۆیدا وەکو مەتەڵێکە، هەر بۆیەش ئەم نامەیەی بەشێوەی کۆدێکی ژمارەیی نووسیوە.

- سعید گوتی: لەگەڵ ڕێزم بۆ قسەکانت نیزال، با وادابنێین لێکدانەوەت بۆ ژمارەکان ڕاستە، ژمارەکان کۆدێکن، چۆن زانیت مەبەست لەم مەتەڵە تۆیت؟!

- لەبەر چەند هۆیەك سعید، پێش هەموو شتێك حاجی متولی ئەو ڕاسپاردەیەی شاردبووەوە کە دایکم لای دانابوو، بە ئەگەری زۆر ئەو کەسانەی کوشتوویانە دەیانزانی، یان بە لایەنی کەمەوە گومانیان کردووە کە من بەم زووانە دێمە ئێرە بۆ وەرگرتنی ڕاسپاردەکە، دووەم نووسینی نامەکە بەشێوەی کۆد، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی نامەکەی نووسیوە من باش دەناسێت!

- مەبەستت ئەوەیە کە نووسەری ئەو نامە ژمارەییە گرنگیدانی تۆ بە جیهانی هێماکان و خوێندنت لە بواری (زانستی هێماناسی - Symbology) دەزانێت؟

- ڕاسته، وا دیاره ئەوان لە دایكمەوە هەموو شتێكیان دەربارەی من زانیوە.

- عبدالعزیز پرسی: بەڵام تەنیا نوسینی نامەکە بە خوێن و بەشێوەی کۆد وای لە تۆ کرد پێتوابێت ئەم نامەیە نامەیەکی هەڕەشەیە و ئاڕاستەی تۆ کراوە؟

- هەموو ئەوانە نیشانەی بەهێزن، بەڵام خودی ژمارەکان ڕاستەوخۆ هەڕەشەی کوشتننە لە من!

عبدالعزیز لە وێنەی ژمارەکان ورد دەبویەوە بەو هیوایەی لە مەبەستی نیزال تێبگات پاشان گوتی:

- من جگە لە چوار ژمارە کە هیچ واتایەك هەڵناگرن چیتر نابینم ۰۱۲۳، بەپێی لێکدانەوەکەت ژمارە ۱ کەمە لەم زنجیرەیە ئەمەش هیچ شتێکی جێی گومان نییە.

- هاوڕێی شیرینم عبدالعزیز، وا دیارە تۆ ئەوەت لەیاد کردووە کە لە کاتی دۆزینەوەی کۆدی بەربەڕۆسا پێم گوتی! هەر مرۆڤێك شتەکان بە ئاوێنەی تایبەتیی خۆی دەبینێت، ئەوەی تۆ دەیبینی مەرج نییە هەمان ئەوە بێت کە من دەیبینم، ئەوەش کە من دەیبینم مەرج نییە تۆ بیبینی، بە واتایەکی تر تاکە شتێك دەکرێت چەند کەسێك بەشێوەی جیاواز بیبینن بەپێی ئەزموونی تایبەتیی خۆمان و زانست و ئەو گۆشەیەی هەریەك لە ئێمە بەکاری دەهێنێت بۆ بینینی ئەو شتە، هاوڕێ، ئێمە شتەکان بەو شێوەیە دەبینین کە ژیریمان دەیەوێت بیبینێت!

- تۆ لەو ژمارەیە چی دەبینی؟ ببورە.... ژیریت چی دەبینێت؟ عبدالعزیز بەگاڵتەجاڕییەوە پرسیارەکەی کرد.

- ژیریم وا دەبینێت کە ئەو نامەیە ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی من کراوە، ئەگەر ئەو ژمارانە بەو ژمارەیە دەستی پێکردبا کە ژمارە ١ و ئێستا کەمە، سێ ژمارەی یەکەم دەبووە ١٠١!

- سعید بەسەرسوڕمانەوە گوێی لە کۆتا قسەی نیزال گرتبوو بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات، پێش ئەوەی بێدەنگی بشکێنێت بە دەنگێکی پڕ لە سەرسامییەوە لە نیزالی پرسی:

- واتای دوو ژمارە ماوەکەی تر چین ٢٣؟ هیچ بەڵگەیەکی تێدایە لەسەر هەڕەشەکانیان؟

نیزال بۆ ساتێك بێدەنگ بوو پاشان هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی و گوتی:

- ژمارە ٢٣ هەڕەشەی ڕاستەقینەیە! ئەم ژمارەیە هێمای مەرگ و ژیانە لەم نامەیە!!

# پوورە خەدیجە

سـەرەڕای ئەوەی لە بچووکییەوە نیزال دایك و باوکی لەدەسـت دابوو، بەڵام پوورە خەدیجەی ئەو باوەشـە گەرمە بوو، کە شـوێنی سـۆزی بـاوك و میهرەبـانیی دایکی بۆ گرتبووەوە، خەدیجەش نیزالی لە شوێنی منداڵی خۆی دانابوو، چونکە منداڵی نەدەبوو، بەڵام ئەنوەری هاوســەری بەپێچەوانەی ئەو بوو، لەبەر هۆکارێك ڕقی لە نیزال بوو، بەدڵڕەقییەوە مـامەڵەی لەگەڵ دەکرد و، چەنـدین جـار هەوڵی دا هاوســـەرەکەی ڕازیبکات تاوەکوو لە خانەی بێنەوایانی دابنێن، بەڵام هاوسـەرەکەی ڕەتی کردەوە، پێشـی ڕاگەیاند داوای جیابونەوە دەکات ئەگەر هەوڵبدات نیزالی لێ دوربخانەوە، بۆیە ڕازی بوو بە مانەوەی نیزال لە ماڵەکەی بەتایبەت کە دەیزانی خێزانەکەی خاوەنی خانوەکەیە، خەدیجە لە پـارەی تـایبەتی خۆی کە لە بـاوکیەوە بۆی بەجێمـابوو خەرجی نیزالی دەکێشا و ئامادەبوو نەك واز لە هاوسـەرەکەی، بەڵکوو لە هەموو جیهانیش بهێنێت لەپێناو پاراســـتنی منداڵە بێنەواکەی کوڕی برای.

خەدیجە وەکوو پورێـك مـامەڵەی لەگەڵ نیزال نەدەکرد، بەڵکو وەك هـاوڕێیەك بوو لەگەڵی و، بۆ ئەو هەموو ژیـانی بوو، بۆ نیزال مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵانی تر زەحمەت بوو و، هەرکاتێك کەسـێك قسـەی لەگەڵ دەکرد تەرکیزی لەدەسـت دەدا، خەدیجە تاکە مرۆڤ بوو کە نیزال هەســـتی بە ئارامی دەکرد لەگەڵی، چونکە تەنیا بە

سەیرکردنی چاوەکانی لێی تێدەگەیشت بەبێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات، نیزالیش هەستی بەو دڵتەنگییەی پوری دەکرد کە دەیویست بیشارێتەوە، ئەو دەیزانی کە پوری لە ژیان لەگەڵ ئەنوەر کە لە هەمان کات کوڕی پلکیشی بوو ڕازی نەبوو، بەڵام ئەوەی بۆ نیزال نەدەدرکاند و نەیدەزانی کە ئەو هەمووشتێك دەزانێت، ئەوان کاتێکی زۆریان بە قسەکردن لەگەڵ یەکتری بەسەر دەبرد بەبێ ئەوەی یەکێکیان هەست بە بێزاری بکات، نیزال هەر کێشەیەکی بۆ پێش هاتبا هانای بۆ پووری دەبرد، ئەویش ئامۆژگاریی دەکرد کە ئەمەش یارمەتیدەر بوو لە پێکهێنانی کەسایەتییە تایبەتیەکەیدا، خەدیجە هەمیشە بەزەردەخەنەوە پێشوازیی لێدەکرد کاتێك نیزال دەهات بەگریانەوە گلەیی ئەو سەختییانەی لا دەکرد کە ڕێیان پێدەگرت لە ژیان، ئەمیش بە سنگیەوە دەیگوشی و بە دەستە نەرمەکانی فرمێسکەکانی دەسڕی پاشان بە هەموو دڵنیاییەکەوە پێی دەگوت: دڵتەنگ مەبە، هەمووشتێك باش دەبێت، قەدەری خوای گەورە هەمووی چاکەیە، تەنانەت گەر تۆ لەسەرەتاوە ئەمە نەبینی، بەدڵنیاییەوە ڕۆژێك لە ڕۆژان دەیبینی، بشزانە تاریکترین کاتی شەو ئەو کاتەیە دەکەوێتە پێش خۆرهەڵاتن، شەوگاریش چەند درێژ بێت بەردەوام نابێت، هەمیشە ئەم ئایەتەی خوای پەروەردگارت لەیادبێت: ﴿وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾﴾.

وشەکانی خەدیجە هیوا و ئومێدیان لە دڵی نیزال دەچاند و، تەنیا بە بیستنی دەنگی هیچ خەمێکی نەدەما، لە دوور وڵاتیش هەمیشە

پەیوەندیی پێوە دەکرد کاتێك بە هەر هۆکارێك دڵتەنگ بوایە، لەگەڵ بیستنی دەنگی تەواوی خەمەکانی باریان دەکرد.

ســـەختترین ڕۆژی نیزال ئەو ڕۆژە بوو کە ئەنوەری هاوســـەری پورە خەدیجەی پەیوەنـدی پێوە کرد تـاوەکوو پێی ڕابگەیەنێـت کە پوورە خەدیجەی بەهۆی ڕووداوێکی هاتوچۆوە گیانی لەدەســـت داوە، لەم کاتەدا نیزال تووشی شۆکێك بوو نەیتوانی بیر لە هیچ شتێك بکاتەوە و، هەســـتی دەکرد مێشـــکی خەریکە بتەقێت لە ئەنجامی ئەو پاڵەپەستۆیەی تووشی بووبوو، دوای ئەوەی نیزال ئاگای لە دونیای دەرەوە نەما و تاکە شـــت کە دەیبیســـت لێدانی دڵی بوو کە بەرەبەرە هێواش دەبوویەوە، پاشـان توانای وەستانی نەما، کەوتە سەر زەوی و، چاوەڕوانیی ئەوە بوو بەیەکجاری دڵی لە لێدان بوەســـتێت، لەم کاتەدا بەدیـاریکراوی، نیزال زەردەخەنەکـانی پوورە نەرمونیـانەکەی بینی، هەروەها باوەشـە گەرمەکەی کەوتەوە یاد کە شـوێنی بەتاڵیی دایکی بۆ گرتبووەوە کە لە منداڵیدا لەدەسـتی دابوو، هەروەها بیری کەوتەوە کە پووری هـانی دەدا بۆ بەردەوامبوون لەســـەر ڕێگـای ژیـان و دەستەکانی توونـد دەگرت وەکوو ئاماژەیەك بۆ ئەوەی هەمیشـە بەهێز بێـت، لەم کـاتـانەدا گوتەکـانی پووری بیردەکەوتەوە کە لەم جۆرە بارودۆخانەدا پێی دەگوت: خەم مەخۆ، هەمووشـــتێك باش دەبێت، قەدەری خوای گەورە هەمووی خێرە، دووبارە ژیان گەڕایەوە بۆ دڵی نیزال و، بڕیاری دا ئارام بگرێت لەســـەر دابڕانی پووری، دواتر نیزال زانی کە حەشـاشـیەکان پلانی کوشـتنی پووریان بەم شـێوەیە جێبەجێ

کردووە دوای ئەوەی ڕەتی کردووەتەوە ئەو زانیاریانەیان پێبدات کە ببێتە هۆی دۆزینەوەی شوێنی دایکی.

# نهێنیی ژماره ٢٣

- له ژیانمدا نه‌مبیستووه که ژماره ٢٣ هیچ واتایه‌کی هه‌بێت! ئه‌وه‌ی ده‌یڵێی هیچ بنه‌مایه‌کی زانستی هه‌یه؟ یاخود ته‌نیا لێکدانه‌وه‌ی خۆته؟! عبدالعزیز ئه‌م پرسیاره‌ی کرد له کاتێکدا به‌ئاشکرا نیشانه‌کانی سه‌رسوڕمانی پێوه‌دیاربوو.

- مه‌رج نییه هه‌موو ئه‌وه‌ی ده‌یڵێم باوه‌ڕی تایبه‌تیی من بێت، به‌ڵکوو ئه‌وه لێکدانه‌وه‌ی دیارده‌یه‌کی ئێستامانه، زۆر که‌س باوه‌ڕی به په‌یوه‌ندیی ژماره‌کان به کاروباری ده‌وروبه‌ریانه‌وه هه‌یه، له کاتێکدا هه‌ندێ که‌س ژماره ٧ به ژماره‌ی به‌خت داده‌نێن، هه‌روه‌ها ژماره ١٣ به ژماره‌ی به‌دبه‌ختی داده‌نێن، ئه‌وا ژماره ٢٣ لای زۆر که‌س په‌یوه‌سته به ڕوداوه‌کانی" ژیان و مردن" له زمانی هێماکاندا.

- سعید پرسی: زمانی هێماکان؟!

- به‌ڵێ، سعید، ڕێکخراوه نهێنی و کۆمه‌ڵه ئاینیه‌کان که له پشت په‌رده و به‌نهێنی کارده‌که‌ن، هه‌روه‌ها ئاژانسه‌کانی هه‌واڵگری له کاروباره‌کانیان به‌زۆری زمانی هێما به‌کارده‌هێنن، سروشتی کاره نهێنیه‌کانیان داخوازیی ئه‌وه‌یه زمانێك به‌کاربهێنن له هێما پێکهاتبێت، هێماکان کات و هه‌وڵی زۆرمان بۆ ده‌گێڕنه‌وه بۆ گه‌یاندنی په‌یامه‌کانمان، واته ده‌کرێت تاکه هێمایه‌ك چه‌ندین وشه و ڕسته‌مان بۆ کورت بکاته‌وه که ده‌مانه‌وێت بیگه‌یه‌نین، ژماره‌کانیش له زۆرترینی ئه‌و هێمایانه‌ن که له‌لایه‌ن ئه‌و که‌سانه‌وه به‌کارده‌هێنرێن.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام لەسەر چ بنچینەیەك ئەو کەسانە ژمارە ٢٣ بە هێمای ژیان و مردن دادەنێن؟

- کۆمەڵە هۆکارێکی مێژوویی هەن، کە هەندێکی ڕاستەقینەن و هەندێکیشی لەلایەن ئەو کەسانەوە دروست کراون کە باوەڕیان بە بیرۆکەی موئامەرە هەیە، ئەو باوەڕەی لای ئەو کەسانە قوڵکردۆتەوە کە باوەڕیان بە سروشتی ئەو ژمارەیە هەیە، بۆ نموونە، (یۆلیۆس قەیسەر) یەکەمین ئیمپراتۆری ڕۆمانی لە مێژوودا، وا ناسراوە لە مێژوودا بە لێدانی ٢٣ خەنجەر کوژراوە!

- عبدالعزیز گوتی: بەڵام ئەو ڕووداوە بەس نییە بۆ بەستنەوەی ئەو ژمارەیە بە مردنەوە!

- کەمێك ئارام بگرە هاوڕێ، دوای ئەوە ژمارە ٢٣ بەشێوەیەکی سەیر لەو ڕووداوانە دووبارە بووەتەوە کە پەیوەندییان بە ژیان و مردنەوە هەیە، بۆ نموونە، زانستی سەردەم سەلماندویەتی کە جەستەی مرۆڤ لە ٢٣ جوت کرۆمۆسۆم پێکدێت، ژیانی کۆرپەلە دەست پێ دەکات بە پێکهاتنی ٢٣ جوت لە کرۆمۆسۆم کە نیوەی لە دایکیەوە بۆی دێت و نیوەکەی تریشی لە باوکیەوە، هەروەها سوڕی زیندەگی ژیان لە ٢٣ ڕۆژ پێکدێت، هەروەها ئەگەر دەتەوێت ئەم ژمارەیە بە ڕووداوە مێژووییەکانەوە ببەستیتەوە، ئەوا وەکوو دەزانرێت پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) دوای ٢٣ساڵ لە بانگەوازکردن کۆچی دوایی کرد، هەروەها نوسەری ئینگلیزی ناودار (ویلیام شکسپیر) لە ٢٣ی مانگی ئەیپرەڵی ١٥٦٤ز لە دایکبوە و، لە ٢٣ی مانگی ئەیپرەڵی

١٦١٦ز كۆچی دوایی كردووە، سەرەڕای ئەمەش یاریزانی تۆپی پێی كامیرۆنی (مارك فیفیان فویە) لە میانەی یاریكردنی لە جامی كیشـوەرەكان لە سـالّی ٢٠٠٣ز كۆچی دوایی كرد، لێكچونی ژمارە ٢٠٠٣، و ژمارە ٢٣ شـاراوە نییە لە كەس، سـەرەڕای ئەوەی ئەم یاریزانە هەڵگری درێسی ژمارە ٢٣ بوو لە یانەی مانچیستەر سیتی كە ناوبراو كاتی مردنی یاریزانی ئەو یانەیە بوو، لەو ساتەشـەوە ئەو یانەیە ئەو درێسـەی نەداوە بە هیچ یاریزانێكی تر، هەندێك كەس لە لێكدانەوەكانیان زیاتر لەوەش دەڵێن، پێیان وایە ژمارە ٢٣ پەیوەندی بەو سـاڵەوە هەیە كە زانای زیندەزانی ناودار (داروین) پەرتووكەكەی تێدا بڵاوكردەوە، كە باس لە بنچینەی ژیان و بیردۆزی پەرەسـەندن دەكات، ژمارەكانی ئەو سـاڵەیان ١٨٥٩ كۆكردوەتەوە كە دەكاتە ٢٣، هەندێك كەس لەمەش زیاتر دەڵێن و پێیان وایە ئەو كەسانەی هەستاون بە ڕووداوی ١١ی سێپتەمبەر لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا، هەسـتاون بە هەڵبژاردنی ئەم ڕێكەوتە لەبەر پەیوەندی بە ژمارە هێمای ٢٣، كۆی ژمارەكانی ڕۆژ و مانگ و ساڵ و هەزارەی ئەو ڕۆژەی ئەم ڕووداوەی تێدا ڕوویدا ١١-١-٢٠٠١-٩ دەكاتە ٢٣، تەنانەت لە ئەدەب و سینەمای ئەمریكی، ئەو فیلمانەی دەرهێنەرانی هۆلیۆد بەرهەمی دەهێنن ژمارە ٢٣ پشـكی گەورەی هەیە تێیاندا، ئەم ژمارەیە لە زۆربەی ئەو فیلمانەدا دووبارە دەبێتەوە كە باس لە كارەسات و ڕووداوە ناخۆشەكان و مردنیش دەكەن!

- عبدالعزیز پرسـیی: ئایە بەڕاسـتی نیزال تۆ باوەڕت بە پەیوەندیی ژمارە ٢٣ هەیە بە ژیان و مردنەوە؟

- من وەکوو خۆم باوەڕم بەم شـتانە نییە، پێم وایە زیادەڕەویی زۆریان تێدایە، هەڵەیە پێمان وابێت ژمارەیەك مایەی ڕەشـبینی بێت، یاخود ژمارەیەکی سـیحری مایەی هێنانی بەختی باشـە، بەڵام من لێرەدا تەنیا دەمەوێت لێکدانەوە بۆ بیرکردنەوەی ئەو کەسـانە بکەم کە باوەڕیان بەم جۆرە شتانە هەیە.

- سـعید گوتی: کەواتە ژمـارە ٢٣ لە کۆتـایی نـامە ژمارەییەکەی بکوژانی مامم، مەبەستیان هەڕەشەی ڕاستەوخۆیە لە تۆ ١٠١، واتە ئەوان بە زمانی خۆیان تۆیان سەرپشك کردووە لەنێوان ژیان و مردن!

- لەوانەیە ئەوە لێکدانەوەیەکی زیاتر لۆجیکی بێت، وا دیـارە ئەوان دەیـانەوێـت من واز لە تەواوکردنی ڕێگـاکەی دایکم بهێنم، بەهەرحـاڵ هەڕەشـەکـانیـان وەکوو نەبوو وایە بۆ من و هیچ لە بڕیـارەکەی من نـاگۆڕێـت لە ڕووبەڕووبونەوەی ئەو بکوژانە، بۆیە سـعید ئێسـتا دەمەوێت تەواوی ئەو فایلەم پێبدەیت کە دایکم لای مامت جێی هێشتبوو، دەترسم کات لە بەرژەوەندیمان نەبێت.

- پێتی دەدەم، بەڵام بە مەرجێك!

- مەرج؟ چ مەرجێك سعید؟!

- مەرجەکەم ئەوەیە بانگهێشـتەکەم بۆ نانی ئێوارە بۆ مـاڵە خاکییەکەمان قبووڵ بکەی، ناگونجێ سەردانی ئیسکەندەرییە بکەیت

و لە ماسییەکەی نەخۆیت، پاشان ئەمانەتەکەت پێدەدەم کە لەلامە.

– باشە من بانگهێشتەکەت قبووڵ دەکەم و گەورە دەبم بە سەردانیتان، پێم وایە عبدالعزیزیش خۆشحاڵە بەمە، بەڵام ئێمەش مەرجمان هەیە بۆ قبووڵکردنی بانگهێشتەکەت!

- هەر مەرجێکت هەیە بیڵێ نیزال.

- دەمەوێت ئەم بڕە پارە سادەیە وەکوو دیاری لەلایەن من و عبدالعزیزەوە بگەیەنیتە خێزانی حاجی متولی، سەرەخۆشیی ئێمەشی پێ ڕابگەیەنە، حەزمان دەکرد سەردانیان بکەین و سەرەخۆشیی خۆمانیان پێ ڕابگەیەنین، بەڵام پێم وا نییە ژیرانە بێت لەم کاتەدا سەردانی ماڵەوەیان بکەین دوای ئەو شتەی لە کتێبخانە ڕوویدا!

- بەو شێوەیە دەبێت کە تۆ دەتەوێت هاوڕێ.

# حەشاشییە نوێیەکان

لەمیانەی گەڕانی نیزال و عبدالعزیز بەدوای نهێنیی بەربەڕۆسـا، بۆیان دەرکەوت بەم دواییانە ڕێکخراوێکی نهێنیی مەترسیدار لە ئێران دروست بووە، بە ئامانجی دەستبەسەرداگرتنی مرۆڤایەتی، عائیشە خاتوون دایکی نیزال تێبینی ئەوەی کردبوو کە ئەم ڕێکخراوە بەدوایدا دەگەڕێن لەپێناو دەستبەسەرداگرتنی لێکۆڵینەوەکانی، ئەمە پاڵی پێوەنا تاوەکوو لێکۆڵینەوەکەی بشارێتەوە و گەشت بۆ شوێنی جیاواز بکات بۆ شاردنەوەی پەتەکانی ئەو نهێنیەی بۆ منداڵەکەی جێهێشتبوو، لەم نهێنییەدا عائیشە خاتوون کوڕەکەی لەم ڕێکخراوە ئاگادار کردبووەوە، کە نیزال ناوی نابوون ڕێکخراوی حەشاشییە نوێیەکان، ئەمەش لەبەر پەیوەستییان بە حەشاشییە کۆنەکان، لە کۆتایی گەڕان بەدوای کۆدی بەربەڕۆسادا، نیزال بۆی دەرکەوت ئەم ڕێکخراوە توانیویانە دایکی لە مەغریبەوە بڕفێنن بەرەو تەهران.

مێژووی ئەم ڕێکخراوە دەگەڕێتەوە بۆ سەدان ساڵ لەمەوبەر، کەمێك پێش دەرکەوتنی جەنگەکانی خاچپەرستی، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە نهێنیە ڕادەسپێردران بە کوشتن و تیرۆرکردنی هەرکەسێك ببوایەتە کۆسپی بەردەمیان، حەشاشییەکان لە بنچینەدا دەگەڕێنەوە سەر گرووپی ئیسماعیلی نزاری کە گرووپێکن لە گرووپەکانی شیعە. ئەم گرووپە باتنییە لە عوبەیدییەکان (فاتمییەکان) جیابوونەوە کە ئەوانیش بەشێکن لە ئیسماعیلییەکان، ئەمەش لە کۆتایەکانی سەدەی پێنجی

کۆچی بەرانبەر سەدەی یازدەی زایینی، ئەم گرووپە باوەڕیان وایە قورئان لێکدانەوەیەکی باتنی هەیە کە جیاوازە لە واتا ڕوکەشە ئاشکراکەی، بۆیە لێکدانەوەی نامۆیان بۆ زاراوەکانی قورئان هەبوو کە زیاتر لە کۆدی نهێنی دەچوو لەلایەن شێخی ئەم گرووپەوە دیاری دەکرا.

دامەزراندنی ئەم ڕێکخراوە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە ترسناکترین تاوانبارانی مێژووی مرۆڤایەتی، کە پێیدەگوترا (حەسەن سەباح)، حەسەن سەباح یەکێکە لە قەڵا تۆکمەکان کە ئێرانی ئێستای کردە مەڵبەندێکی نهێنی بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازە نهێنییەکەی، ئەم قەڵا تۆکمەیە دەکەوتە نێو چیاکانی (البرز) یاخود دەیلەم لە باشووری دەریاچەی قەزوین و، نزیکەی ١٠٠ کم لە تەهرانی پایتەختەوە دوورە، ئەم قەڵا نهێنییە پێی دەگوترا (قەڵای ئاڵمۆت - Alamut Castle) بە فارسی واتە (لانەی هەڵۆ)، حەسەن سەباح دەستی بەسەر ئەم قەڵایەدا گرت و کردییە بنکەی ڕاهێنانی شوێنکەوتوانی کە بەسەریاندا زاڵ دەبوو لەڕێگەی ڕووەکی حەشیشەوە، بۆیە پێیان دەگوترا حەشاشییەکان، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە ڕادەسپێردران بە کوشتن بە ناپاکی بەبێ ڕووبەڕووبونەوە، بۆیە وشەی کوشتن لە زۆربەی زمانە بیانییەکان لە بنچینەدا لە وشەی (حەشاشین) وەرگیراوە، بۆ نموونە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەی (Assassin) هەروەها کاری (Assassinate) کە بە واتای پیاوکوژێکی

شارەزا دێت کە بەنهێنی خەڵکی تیرۆر دەکات، هەردووکیان لە وشەی (حەشاشین) وەرگیراون.



گەشتیاری بەناوبانگی ئیتالی (مارکۆ پۆلۆ - Marco Polo) کە لە کۆتایەکانی سەدەی سێزدە و سەرەتای سەدەی چواردە بە وڵاتانی ئاسیادا گەڕاوە، چیرۆکێکی ترسناکمان دەربارەی ئەم ڕێکخراوە بۆ دەگێڕێتەوە، هەروەها باسی ئەوە دەکات، کە چۆن سەرکردەکەیان کە نازناوی (شیخ الجبل)ی لێنرابوو بەسەریاندا زاڵ دەبوو، هەرچەندە مارکۆ پۆلۆ لە سەردەمی حەسەن سەباحدا نەژیاوە، بەڵام ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە خەڵکی گێڕاویانەتەوە دەربارەی بنکە نهێنییەکەی حەشاشییەکان کە ناسراوە بە قەڵای ئاڵمۆت، هەروەها چۆنیەتیی زاڵبوون بەسەر شوێنکەوتووەکانیان و گۆڕینیان بۆ ئامێری مرۆڤکوژ: (قەڵاکە باخچەیەکی گەورەی تێدایە پڕە لە میوەجات، کۆشک و کانیاوی تێدایە پڕە لە شیر و هەنگوین و ئاو و شەراب، کچانی شۆخ و شەنگ گۆرانی دەڵێن و سەما دەکەن و مۆسیقا دەژەنن، شیخ الجبل وا لە شوێنکەوتوانی دەگەیەنێت کە ئەم قەڵایە

بەهەشـــتە، قەدەغەیە کەس بچێتە ناوی، تەنیا ئەو کەســـانە دەتوانن بچنە ناوی کە بڕیار دەدەن بچنە ڕیزی حەشاشییەکان، شیخ الجبل دەیانباتە ناو قەڵاکەوە بەشێوەی گرووپ، پاشان حەشیشیان پێدەدات، دواتر دەخەون، پاشـان فرمان دەکات ئەو کەسـانە هەڵبگرن و بیانخەنە ناو باخەکەوە، پاشـان ئەو کەسـانە کە بێدار دەبنەوە وا بیردەکەنەوە کە چوونەتە بەهەشـــت، پاشـــان کە ئارەزووەکانیان تێر دەکەن و خۆشـــی وەردەگرن، جارێکی تر حەشیشـیان پێدەدرێت و بێهۆش دەکرێن، پاشان لە باخەکە دەردەهێنرێن و دەبرێنە لای شـــیخ الجبل لە بەرانبەری دەچەمێنەوە، شـێخیش پرسـیاریان لێدەکات لە کوێوە هاتوون، ئەوانیش وەڵام دەدەنەوە: لە بەهەشتەوە، دوای ئەوە شیخ الجبل ڕایان دەسپێرێت بە کوشـــتنی کەســـانی دیاریکراو و بەڵێنیان پێدەدات ئەگەر لە کارەکانیان ســـەرکەوتوو بوون جارێکیتر دەیانگێڕێتەوە بۆ هەمان بەهەشـــت، ئەگەر لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەشـــیان بکوژرێن فریشتەکان هەڵیان دەگرن و دەیانبەن بۆ بەهەشت).

بەمەش ســـەرکردەی حەشـــاشـــییەکان توانییان زاڵببن بەســـەر شـــوێنکەوتووەکانیان و بیانگۆڕن بۆ ئامێری ترســـناکی مرۆڤکوژ، بەشێوەیەك ئەگەر فرمانیان بە یەکێکیان بکردایە خۆی بکوژێت خۆی دەکوشـت، بەم دەسـتە مرۆڤکوژە ترسـناکە حەشـاشـییەکان توانییان هەرکەسـێك بکوژن دەبێتە بەربەسـتیان، لە مسـوڵمان و نامسـوڵمان، چەندین سـەرکردەی باڵای مسـوڵمان بوونە قوربانیی ئەم دەسـتەیە، یەکەمین قوربانیی دەسـتیان وەزیری فارسـیی دەوڵەتی سـەلجوقی

(نیڤام الملك ی توسی) بوو، کە بە یەکێك لە بەناوبانگترین وەزیرەکان لە مێژووی ئیسلامدا دادەنرێت، پاشان حەشاشییەکان بەردەوام بوون لە کردەوە بکوژەکانیان و زۆرێکیان خۆشیان دەکوشت دوای ئەوەی لە کارەکەیان سەرکەوتوو دەبوون، بەمەش توانییان کەسایەتیی زۆر گەورە بکوژن، لەسەرووی هەمووشیانەوە خەلیفەی عەباسی (المسترشد)، ئەندامانی ئەم ڕێکخراوە ترسناکە توانییان شۆڕ ببنەوە ناو جومگەکانی دەسەڵات و تەنانەت یەکێك لە پاسەوانە تایبەتەکانی سەرکردەی کورد (سەلاحەدینی ئەیوبی) سەر بەم ڕێکخراوە نهێنییە بوو، هەروەها حەشاشییەکان چەندین سەرکردەی خاچپەرستەکانیان تیرۆر کرد، لێرەوە ئەوروپییەکان دەستیان کرد بە بەکارهێنانی وشەی (ئەساسین) بۆ کردەوەکانی تیرۆرکردن و کوشتنی نهێنی.

لە ناوەڕاستی سەدەی سێزدەی زایینی، حەشاشییەکان کۆتاییان پێهات لەگەڵ وێرانکردنی قەڵاکەیان لەلایەن سەرکردەی مەغۆلی (هۆلاکۆ خان)، پێش داگیرکردنی بەغداد هۆلاکۆ هەستا بە وێرانکردنی قەڵای ئالمۆت لە ساڵی ١٢٥٦ز، بەمەش توانیی کۆتایی بە حەشاشییەکان بهێنێت و پاشماوەکەشیان ڕاوبنێت، لە ساڵی ٢٠٠٤ز ئەو دیوارانەی قەڵاکە، کە مابوون داڕووخان بەهۆی ئەو بومەلەرزە بەهێزەی ئێرانی هەژاند لەو ساڵەدا، نیزال پێی وابوو کە داڕووخانی یەکجاریی قەڵای حەشاشییەکان بەهۆی ئەو بومەلەرزە بەهێزەی ئێرانی هەژاند لەم ساڵانەی دواییدا ئەم بیرۆکە توندڕەوییەی تازە کردبێتەوە و دووبارە خۆیان ڕێك خستبێتەوە لەژێر ناوی (حەشاشییە نوێیەکان)، هاوشێوەی

(نازییە نوێیەکان) کە لەم ســــاڵانەی دواییدا خۆیان ڕێك خســـتەوە لەگەڵ بەرەوپێشچوونی ڕاسترەوە توندڕەوەکان لە ئەورووپا.

# پەرۆشم بۆ سایە و سێبەرت دایە

پەیوەندیی نیزال بە پشـــیلەکانەوە لە تەمەنێکی بچووکەوە دەســـتی پێکرد، لەو کاتەوەی لە قاوەخانە لای ئەنوەری هاوســـەری پووری کاری دەکرد، ئەو کاتەی نیزال تەمەنی حەوت ساڵان بوو، هاوسەری پووری لەو کۆمپانیایەی کاری تێدا دەکرد دەرکرا بەهۆی ئەو گومانانەی لەســـەری بوون بە وەرگرتنی بەرتیل، دوای ئەوەی هیچ کۆمپـانیـایەك ڕازی نەبوو وەکوو کـارمەنـد وەری بگرن، خەدیجە قاوەخانەیەکی بچووکی بۆ بەکرێ گرت تاوەکوو کاری تێدا بکات، ئەمەش دوای ئەوەی هەســـتی کرد مانەوەی بەردەوامی لە ماڵەوە بەبێ کار تووڕەبوونەکەی زیاد دەکات و بێزارییەکی زۆر بۆ خۆی و نیزال دروست دەکات، لەبەر ئەوەی کەسێکی چاوچنۆك و ستەمکار بوو لە مامەڵەکردن لەگەڵ شـاگردەکانی بۆیە هیچ کەسێك ئامادە نەبوو لە حەفتەیەك زیاتر لای بمێنێتەوە، بۆیە ئەنوەر ویســـتی نیزال بباتە لای خۆی بۆ کارکردن دوای تەواوبوونی دەوامی قوتابخانەی، ئەمەش بۆ پڕکردنەوەی نەبوونی شــــاگرد لە قاوەخانەکەی، بەڵام خەدیجە ڕەتی کردەوە نیزال بڕوات بۆ قاوەخانە بۆ کارکردن لەگەڵ هاوســـەرەکەی، بەڵام لە کۆتاییدا ڕازی بوو دوایی ئەوەی حەزی نیزالی بینیی بۆ کارکردن، بەڵام مەرجی لەگەڵ هاوســـەرەکەی کرد کە نیزال تەنیا کاری ژمێریاریی قاوەخانەکە بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی توانا کردەییەکانی زیاد بکات لە ژمێریاری، نیزالیش خۆشحاڵ بوو بە کارکردن لە قاوەخانە، زۆر چێژی دەبینی لە بینینی دەستەی جیاواز

له خەڵکی لەوانەی بەردەوام سەردانی قاوەخانەکەیان دەکرد، له هەمان کاتدا توانای له کۆنترۆڵکردنی ژمێریاری قاوەخانەکە بەشێوەیەك بوو خاوەنی یەکێك له دوکانەکانی هاوسێیان پێشنیاری کاری بۆ کرد له دوکانەکەی له پشـــووی هاوین بەرانبەر موچەیەکی هەفتانەی باش، بەڵام هاوســـەری پووری بەتووندی ئەو پێشـــنیارەی ڕەتکردەوە بەو بیانووەی که نیزال منداڵێکی بچووکه و نابێت کار بکات، لەجیاتیی ئەوە بەدرێژاییی پشـــووی هاوین کاری به نیزال کرد و بەبێ ئەوەی هیچ پـاداشـــتێکی پێبـدات لەجیـاتیی مـانـدووبونەکـانی، بەڵکوو بەپێچەوانەوە لەترســـیی ئەوەی نەوەك ئەو ئـاگـادار نەبێت و نیزال شوشەیەك ساردی بخواتەوە هاوسەرە چاوچنۆکەکەی پووری هەمیشه شوشەکانی لەناو ساردکەرەوەدا دەژمارد!

نیزال له بچووکییەوە دەیزانی هاوســـەری پووری کەســـێکی چەند چاوچنۆکه و ئەمی خۆشـــناوێت، هەرگیز ئەو ڕۆژەی لەیاد ناچێت که هاوســەری پووری ســەرکۆنەی کرد بەهۆی لەدەستدانی موچەی ڕۆژێك کارکردنی له کۆمپانیاکەی دوای ئەوەی ناچار بوو زوو دەست له کـارەکەی هەڵبگرێـت و ســـەردانی بنکەی پۆلیس بکـات بۆ وەرگرتنەوەی نیزال دوای ئەوەی له بیایان ون بووبوو، بەڵام نیزال به کارکردن لەگەڵ ئەم پیاوە بۆی دەرکەوت که چاوچنۆکیی و ڕقی ئەم پیاوە زۆر لەوە زیاترە که پێی وابوو، له یەکێك له ڕۆژەکانی هاوین و دوای ڕۆژێکی درێژی کارکردن نیزال هێندە ماندوو بوو لەسەر قەنەفه بچوکەکەی قاوەخانەکه مایەوە، بەیانی توشـی سـەرسـوڕمان بوو که

بینی بەدرێژایی شەو لەسەر پارچەیەکی تەنك لەسەر چیمەنتۆکە ماوەتەوە، بەمەش هەستی بە ئازار دەکرد لە پشتیدا، ئەوەی زیاتر تووشی سەرسوڕمانی کرد ئەوە بوو کە بینی پیاوێکی بێگانە لەسەر جێگاکەی لەسەر قەنەفەکە خەوتووە، کاتێك هاوسەری پووری لە خەو هەستا کە لە ژوورێکی لابەلای قاوەخانەکە نووستبوو هۆکاری ئەمەی لێ پرسی، ئەمیش وەڵامی دایەوە و پێی گوت ئەم پیاوە ڕێبوارە و هیچ شوێنێکی نەبوو، بۆیە ڕێگەم پێدا لێرە بخەوێت دوای ئەوەی تۆم گواستەوە سەر زەوی قاوەخانەکە ئەمەش تەنیا لەپێناو پاداشتی دوارۆژدا، بەڵام نیزال لەم هەواڵە دڵنیا نەبوو، چونکە ڕانەهاتبوو ببینێت ئەو پیاوە چاوچنۆکە هیچ شتێك بەبێ بەرانبەر بکات، ئەو تەنانەت داوای پارەی ڕێگای لە هاوسەرەکەی دەکرد کاتێك بە ئۆتۆمبێلەکەی دەیگەیاندە لای هاوڕێکانی، بۆیە نیزال پێی سەیر نەبوو کاتێك زانی هاوسەری پووری بڕە پارەیەکی لەو پیاوە وەرگرتووە بەرانبەر مانەوەی ئەو شەوەی لەسەر قەنەفەی قاوەخانەکە!

ڕۆژێك لە ڕۆژان دوای ئاوابوونی خۆر و دوای ئەوەی کەسانێکی زۆر سەردانی قاوەخانەکەیان کرد و ئەنوەر پارەیەکی باشی دەست کەوت، ئەنوەر بڕیاری دا ئاهەنگ بگێڕێت بەبۆنەی ئەو قازانجەی لەو ڕۆژە دەستی کەوتبوو لە ڕێگای کڕینی پارچەیەك گۆشتی چێڵی لە قتوونراو، بەڵام نەیویست نیزال هاوبەشی پێبکات کە بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵی ماندوو بووبوو، بەڵکوو تەنیا پارچەیەك نانی وشکی پێ دا لەسەریشی پارچەیەکی زۆر بچووك لە گۆشتی چێڵ،

داواشـــی لێکرد بچێتە دەرەوەی قاوەخانە لەدووریی ئەو خواردنەکەی بخوات، بۆیە نیزال خواردنەکەی هەڵگرت بەرەو بـاخچەی دواوەی قـاوەخـانەکە بۆ ئەوەی خۆی تێربکـات بەو خواردنە کەمە دوای ڕۆژێکی پڕماندووبوون، پێش ئەوەی دەســـت بە خواردن بکات، نیزال تێبینی پشـــیلەیەکی داماوی کرد بەدەوریدا دەگەڕا، هەر زوو نیزال تێگەیشت برسێتی زۆری بۆ پشیلەکە هێناوە زیاتر لە برسێتییەکەی ئەو، بۆیە نیوەی گۆشتەکەی خۆی پێ دا، بۆیە تووشی سەرسوڕمان بوو کاتێك بینی پشـــیلەکە لەجیاتیی ئەوەی گۆشـــتەکە بخوات، گۆشـــتەکەی هەڵگرت بەرەو ئەمبـارخـانەیەکی چۆڵی نزیـك لە قاوەخانەکە، بۆیە شـــوێنی کەوت بۆ ناو ئەمبارخانە چۆڵەکە، بینی پشیلەکە گۆشتەکەی دا بە بێچووەکانی کە لەدەوری کۆبووبوونەوە بۆ ئەوەی ئەوە بخۆن کە دایکیان بۆی هێنابوون، فرمێســـك بەســـەر گۆناکانی نیزالدا هاتە خوارەوە، سێبەری دایکی هاتەوە یاد کە بەحاڵ دەنگی دەهاتەوە بیر، پاشان تەواوی گۆشتەکەی کە لای مابوو دای بە پشیلەو بێچوەکانی، نیزال تەنیا نانە وشکەکەی خوارد و بەپەرۆشەوە چاودێریی پشـیلەو بێچووەکانی دەکرد و زۆر خۆشـحاڵ بوو، بزەیەکی لێوانلێو لەشادی دەربڕی ئەو خۆشحاڵیەی بوو، لەو ڕۆژەوە چیرۆکی نیزال لە ڕاونانی پشـیلەکان دەستی پێکرد تاوەکوو لانەکانیان ئاشـکرا بکات، پاشـان بەشـادییەوە بۆ چەند خولەکێك سـەیری بەچکەکانی دەکرد کە بەدەوری دایکیـانـدا دەهـاتن، پـاشـــان دەگەڕایەوە بەرەو

قاوەخانەکە، دەیبینی هێشتا هاوسەری پووری دانیشتووە و خەریکی خواردنەکەیەتی.

# هێمای نەناسراو



نیزال لە فڕۆکە لە تەنیشت هاوڕێکەی عبدالعزیز دانیشتبوو پەڕەکانی لێکۆڵینەوەکەی هەڵدەدایەوە، نیشـانەی سـەرسـوڕمان و شـۆك بە ڕووخسـاریەوە ئـاشـکرابوو کـاتێـك نقوم ببوو لە خوێنـدنەوەی لێکۆڵینەوەکە.

- نیزال بەسەرسوڕمانەوە گوتی: شتێك هەیە لەم لێکۆڵینەوەیە کە من لەو کاتەی لە ئیسکەندەرییە وەرم گرتووە لێی تێنەگەیشتووم!
- ئەو شتە چییە هاوڕێ؟
- زانیارییەکانی ناو ئەم لێکۆڵینەوەیە زۆر سەیرن! بەشێوەیەکی زۆر وورد باسـی مێژووی ئاریۆس و ئارییسـیەکان دەکات، هەروەها باسـی تاوانەکانی چەتەکانی قدیس یۆحەننا دەکات لە شـاردنەوەی مێژووی ئارییسیەکان لە سەدان ساڵەوە، لەگەڵ ئەوەش زۆر بەوردی و بەبەڵگەوە باسـی تاوانە نهێنییەکانی ئەم پەنجا سـاڵەی دوای ئەو چەتانە دەکات، تێگەیشـتم کە چەتەکان دەیانەوێت ئەم زانیارییە ترسـناکانە بەنهێنی بمێننەوە، نازانم دایکم چۆن ئەو زانیارییانەی

دەســـکەوتوە، بەڵام تێناگەم بۆچی حەشـاشـــییە نوێیەکان دەیانەوێت دەست بەسەر ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بگرن؟!

- لەوانەیە ئەوە ململانێی بەرژەوەنـدیی نێوان ئەو دوو گرووپە چەتەیە بێت!

- پێم وانیە عبـدالعزیز، هەموو گرووپە چەتەکـان زانیـاریی ترســناك دەربارەی یەکتری دەزانن، پێم وانیە حەشـــاشــییە نوێیەکان هەموو ئەوەی کردوویانە تەنیا بۆ ئەوە بووبێت ئەو زانیارییانە بزانن، لەوانەیە کـارەکە زیـاتر بێت لەوە، شـــتێکی نـادیـار هەیە، ڕەنگە وەڵامەکەی لەو پەڕە بێت کە دایکم بۆی جێهێشتووم!

عبدالعزیز تێبینی دوو دڵی نیزالی کرد کاتێك قسەی لەگەڵ دەکرد و ســەیری لێکۆڵینەوەکەی دەکرد، بۆیە ویســتی کەمێك هاوڕێکەی لە خوێنـدنەوە دووربخـاتەو کە وادیـاربوو مـانـدووی کردبوو، بۆیە لێی پرسی:

- نیزال، سەرم لە شتێك سوڕماوە لەو کاتەوەی بەدوای کۆدی بەربەرۆسادا دەگەڕاین دەمویست لێت بپرسم!

نیزال لێکۆڵینەوەکەی دەستی دانا و ڕویکردە عبدالعزیز و گوتی:

- ئەو شتە چییە هاوڕێ، کە مێشکتی داگیر کردووە؟

- عبدالعزیز بەزەردەخەنەوە پرسی: هەمیشـە لە خۆمم دەپرسـی چۆن دەتوانی ئەو هەموو زانیارییە مێژووییانەت بەو وردەکارییانەوە لەبیر بێت، لە هەمان کاتدا کلیلەکانی ماڵەکەت لای من لەبیر دەکرد ئەو کاتەی دەهاتیە سەردانم؟

- پێم وایە پێشتر پێم گوتی من لە منداڵییەوە بەدەست شێوانێکی یادگەمەوە دەناڵێنم، کە وام لێدەکات بەقوورسی سادەترین شتەکانی ڕۆژانەم بێتەوە بیر، بەڵام ئەو شێوانە کارناکەنە سەر یادگەی دوورمەودام، بەڵکوو بەپێچەوانەوە دەتوانم زۆربەی ئەو زانیارییانەم بێتەوە بیر کە چەندین ساڵ لەمەوبەر فێریان بووم، بەتایبەت ئەگەر لەو جۆرە زانیارییانە بێت کە بۆ من سەرنجڕاکێشە.

- ڕاستە، زانیارییەکی خۆشم لە یەکێك لە گۆڤارەکان خوێندەوە نووسرابوو: ئاینیشتاین لەنێو هاوڕێکانی بە لاوازی یادگەی ناسراو بووە، بەشێوەیەك کە ناو و ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنی لەبیر دەچوو، عبدالعزیز بە گاڵتەوە گوتی: بەڵام نیشانەکانی بلیمەتی لە تۆ بەدیناکەم.

- نیزال بەزەردەخەنەوە گوتی: ڕەنگە ئەو کاتە بۆ تۆی بسەلمێنم من بلیمەتم کە بیردۆزێك دابنێم و بیردۆزی ڕێژەیی ئاینیشتاین هەڵبوەشێنمەوە، بەڵام سەرەتا پێویستە لەسەرمان نهێنیی ئاریۆس بدۆزینەوە هاوڕێ.

- نیزال، دوای دۆزینەوەی کۆدی بەربەرۆسا لە مەغریب ڕاستەوخۆ پێت وتم ئەم کۆدە ڕێنمونیمان دەکات بۆ نهێنیی ئاریۆس، ئیستا دوای دەستکەوتنی لێکۆڵینەوەکەی دایکت هەمان شتمان بۆ دووپات دەکاتەوە، تا ئێستا تێنەگەیشتووم چۆن بەم دەرەنجامە گەیشتی بەبێ ئەوەی لە نامە دەنگییەکەی دایکت هیچ ئاماژەیەك بە ئاریۆس بکات!

- هەموو هێما دیار و نادیارەکانی کۆدی بەربەڕۆسا ئاماژەیان بەوە دەکرد عبدالعزیز، دەبوایە لەو کاتەوەی پەڕەکەم لەتۆوە وەرگرت کە لەسەر پەڕی بەردی کۆدەکەی لێ نوسرابوو لەوە تێگەیشتبام، بەڵام لە کۆتاییی گەشتەکە لەوە تێگەیشتم!

- نیزال بەڕاستی ئەوە دەڵێیت؟! دەتەوێت پێم بڵێیت کۆدی بەربەڕۆسا هێشتا شتی تازەی تێدایە جگە لەوەی پێیگەیشتین دوای ئەو گەشتە پڕزەحمەتەمان بۆ دۆزینەوەی ئەو کۆدە سەیرە؟!

- نیزال وەڵامی دایەوە: وا پێدەچێت هاوڕێ!

- بەڵام چۆن؟!



- عبـدالعزیز، وەکو لە مەغریـب پێم گوتی، هەنـدێـك لە هێماکانی کۆدی بەربەرۆســا بەئاشــکرا ئاماژە بە ئاریۆس دەکەن، بێژینگەکەی ئیراتوستینس تەنیا ڕێنمونیمان ناکات بۆ ئەو ژمارانەی کە پێویستمانە بۆ شیکردنەوەی کۆدەکەمان، بەڵکوو بەڕوونی ئاماژەش دەکات بۆ شوێنی شیکردنەوەی کۆدەکە، لەسەرەتاوە سەرم سوڕما لە وێنەکێشانی بێژینگ لەناو نامەکە لەجیاتیی ئاماژەدان بەو ژمارانەی کە دەتوانین بەکاریان بهێنین، بەڵام ئێستا پێم وایە خودی بێژینگەکە هێمایە بۆ ئەو شوێنەی کە ناوەندی کۆدەکەمانە.

- مەبەســـتت ئەو تۆڕەیە ئەو بازنەیەی تێدایە کە هێمایە بۆ گۆی زەوی؟

- بەڵێ، بەتەواوی عبدالعزیز، دایکم گۆی زەوی لە ناوەڕاستیدا کێشــاوە نەك تەنیا بۆ ئاماژەدان بە ئیراتوســتینس کە شــێوەی زەوی دۆزییەوە، بەڵکوو ئاماژەشە بۆ ئەو نهێنییە ترسناکەی مێژووی زەوی کە لەپشـــت پەردەی تاریك مایەوە و ڕێیان نەدا مرۆڤایەتی بیزانێت، بوونی هێمایەك کە ئاماژە دەکات بە ئیراتوســـتینس لە خودی خۆیدا ئاماژەیەکی گەورەیە بە ئاریۆس، ئیراتوســتینس لە شــاری قورینای لیبی لە دایك بووە، هەمان ئەو شــارەی ئاریۆس تیایدا لە دایك بووە، پاشـان لە شـاری ئیسـکەندەرییەی میسـری نیشـتەجێ بووە، ئەویش هەمان شارە کە ئاریۆس تیایدا نیشتەجێ بووە!

- عبدالعزیز پرسیی: باشە ئەوە لێکدانەوەیەکی لۆجیکییە، ئایە جگە لەوە نیشانەی دیکەی تێدایە لەسەر ئەوە؟

- هەروەها ئەو پەڕە قامیشـــەیش کە دایکم هەڵیبژاردووە بۆ ئەوەی نامەکەی لەســـەر بنووســـێت لە خودی خۆیدا ئاماژەیەکی گەورەیە بە ئیسـکەندەرییە، ئەو شـارە میسـرییە سـەرچاوەی یەکەمی بەرهەمهێنانی پەڕی قامیشـە لە جیهاندا، سـەرەڕای ئەوە دایکم ئەو شـــارەی هەڵبژاردووە بۆ ئەنجامـدانی لێکۆڵینەوەکەی، هەروەها هەڵیبژاردووە بۆ ئەوەی فایلی لێکۆڵینەوەکەی تێدا حەشـــار بدات، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسـەر ناوەندێتیی شـاری ئیسـکەندەرییە لەو نهێنییەی کۆدەکەمان حەشـاری داوە، شـاری ئیسـکەندەرییە خاڵی دەسـتپێکی بڵاوبوونەوەی بانگەوازی ئاریۆس بوو لە تەواوی جیهاندا، کە هێمای گۆی زەوی کێشراو لەناو بێژینگەکە ئاماژەی پێدەکات!

- ئەوەش لێکدانەوەیەکی لۆجیکییە، بەڵام بۆچی پوورە عائیشە لە نامە دەنگییەکەی ڕاســـتەوخۆ پێی نەگوتووین کە شـــیکاریی مەتەڵەکەمان نهێنیی ئاریۆســـە؟ ئایە هەموو ئەندامانی بنەماڵەکەت وەکوو تۆ حەزیـان لە لێڵی و تەمومژە؟ عبـدالعزیز بەزەردەخەنەوە پرسیاری کرد.

- بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لە نامە دەنگییەکەیدا ئاماژەی بەوە داوە کاتێك گوتیی ئەو نهێنییە بۆ زیاتر لە ١٥٠٠ ســـاڵە بەنهێنی ماوەتەوە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەو کاتەی ئاریۆسی تێدا دەرکەوتووە لە ســـەدەی چواری زایینی، ســـەرەڕای ئەو ڕێکەوتەی هەڵیبژاردوە بۆ تۆمـارکردنی نـامە دەنگییەکەی، ئەو ڕێکەوتەش ٢٠ی مـایۆیە، ئەو ڕێکەوتەش هەمـان ڕێکەوتی گرێـدانی (کۆنگرەی نیقیە)یە، ئەو

کۆنگرەیەی تێیدا ئاریۆس سەرکردەی یەکێك لە دوو گرووپە ناکۆکە بوو، نیقییە شارێکە دەکەوێتە نزیك شاری ئیستانبوڵ، کە پێشتر پێیدەوترا قوستەنتینییە، ئەو شارەی ئاریۆسی تێدا تیرۆر کرا، ئەویش هەمان شارە کە تێیدا دەستمان کرد بە دۆزینەوەی پەتەکانی کۆدی بەربەرۆسا!

- ئای، خوایە! وا دیارە ژیانی بنەماڵەکەتان لەسەر هێمایە! نیزال باسی کۆنگرەی نیقییەت بۆ نەکردم وەکوو بەڵێنت پێدابووم، هەروەها باسی چیرۆکی ئاریۆست بۆ نەکردم کە هەمووان بەدوایی نهێنییەکەیدا دەگەڕێن!

- باشترە ئەم شتانەت ڕاستەوخۆ لە پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی گوێ لێبێت، دوێنێ دوای ئەوەی چاوێکی خێرام بە مەلەفەکەدا گێڕا پەیوەندیم پێوە کرد، کاتێکم لێوەرگرت بۆ چاوپێکەوتنی تاوەکوو هەندێك شتی لێڵم بۆ ڕوون بکاتەوە.

عبدالعزیز دەستی لەسەر شانی نیزال دانا و بەهێواشی پێی گوت:

- هاوڕێ، تۆ دڵنیای دەتەوێت پرۆفیسۆر بریستلی ببینیت دوای ئەو هەموو شتەی لەنێوانتاندا ڕوویدا؟ جگە لەو هیچ کەسێکی ترت نەدۆزییەوە تاوەکوو پرسیارەکانتی لێبکەی؟

- پرۆفیسۆر بریستلی یەکێکە لە گەورەترین مێژووزانەکانی جیهان کە ئێستا لە ژیاندان، هەروەها یەکێکە لە دیارترین کەسە شارەزاکانیش لەسەر ئاستی جیهان لە مێژووی مرۆڤایەتی لە سەدەی بیست و یەکی زایینی، ئەویش پەرۆش بوو بۆ بینینم دوای ئەوەی

پەیوەندیم پێوە کرد و ئەو زانیارییە ترسناکانەم پێ گوت کە لام بوون، لەلای منەوە ئەوەی لە ڕابردوو لەنێوانمان ڕوویدا بوو، بووە بەشێك لە ڕابردوو، نیزال وەڵامی دایەوە و هەوڵی دەدا لە ڕستەی کۆتاییدا دڵتەنگییەکەی بشارێتەوە.

- ئەو کاتە باشتر نەبوو لە ڕێگای تەلەفۆنەوە پرسیارەکانتی لێبکەی، لەجیاتیی ئەوەی لە ئیسکەندەرییەوە بەتایبەتی گەشت بکەیت بۆ لەندەن بۆ بینینی؟

- هاوڕێ، ئەو جۆرە شتانە بە تەلەفۆن گفتوگۆیان لەسەر ناکرێت، جگە لەوەش کەسێکی تر لە لەندەن دەژی پێویستم بە یارمەتییەتی، ئەگەر لێکدانەوەکەم ڕاست بێت، سێوەکە ئاماژەیە بۆ لەندەن!

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: باسی چی دەکەی نیزال؟ مەبەستت کام سێوە؟

نیزال پەڕەکەی دەرهێنا کە سعید پێی دابوو، پەڕەکە پیت و ژمارەی تێدابوو کە واتاکەی ئاشکرا نەبوو، لەسەرەوەی پەڕەکەش وێنەی سێوێك لەناو سینییەکی قووپاودا کێشرابوو، لەسەر سێوەکەش پیتی (X) نوسراو بوو، نیزال ئاماژەی پێ دا و بە عبدالعزیزی گوت:

- مەبەستم ئەو پەڕەیە، وا هەستدەکەم کلیلی نهێنییەکەی تێدایە، نهێنیی ئاریۆس لە تێگەیشتنی نهێنیی ئەو سێوەدا شاردراوەتەوە!

- چۆن ئەوەت بۆ دەرکەوت؟

- لەو پیتی Xەی لەسەری نووسراوە.
- عبدالعزیز پرسیی: پیتی X واتای چییە؟
- پیتی لاتینیی X هەمیشە ئاماژەیە بە شتێکی نادیار، بۆیە لە جیهاندا لە هاوکێشـە بیرکارییەکاندا بەکار دەهێندرێت بۆ ئاماژەدان بە بڕێکی نادیار، کە بەرانبەرە بە پیتی (س) بۆ ئەو هاوکێشانەی بە زمانی عەرەبی دەنووسـرێن، هەر ئەوەش هۆکارە کە بانگەوازکاری مـافە مەدەنییەکـان (مـاڵکۆم ئێکس - Malcolm X) ی ئەمریکیی مسـوڵمان ئەو پیتە هەڵبژێرێت تاوەکوو ببێتە ناوی تازەی خانەوادەکەی، لەجیاتیی نـاوە کۆنەکەی (Malcolm Little)، چونکە پێی وابوو ناوی بنەماڵە ڕەشـپێسـتەکانی ئەمریکا کە لە بنەڕەتدا ئەفریقی بوون ناوی ڕاستەقینە نین و لەلایەن بنەماڵە سپی پێستەکانەوە بەسەر باپیرانیاندا سەپێندراوە کە کرابوونە کۆیلە لەلایەن سـپی پێسـتە ئەوروپییەکانەوە، بۆیە پیتی (X)ی هەڵبژارد بۆ ناوی بنەمـاڵەکەی لەجیـاتیی ئەو نـاوەی لە مـاوەی کۆیلایەتیـدا بۆیـان مابوویەوە.
- نیزال گوتی: بەو بۆنەیەوە هـاوڕێ، دەزانی ئێمەی عـەرەب هۆکار بووین بۆ هەڵبژاردنی ئەو پیتە بۆ ڕادەی نادیار، یان شـتێکی نەناسراو؟
- عبدالعزیز گوتی: بەڵام چۆن؟!
- هۆکـاری ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ زمـانی عـەرەبی، ئەورووپـا لە سـەدەکانی ناوەڕاسـت نقوم بووبوو لە تاریکی و نەزانی، لە زانسـتە

کردەییەکـان و بەتـایبەت زانســـتی بیرکـاری دواکەوتوو بوون، بەپێچەوانەی مسـولّمانان کە ئەو کاتە لە لوتکەی پێشـکەوتندا بوون، ئەو کاتە زمانی عەرەبی زمانی زانست و پێشکەوتنی شارستانیەت بوو، کاتێك ئیســـپانییەکان کتێبی مســـولّمانە ئەندەلوســـییەکانیان خوێندەوە، بینییان مسـولّمانان پیتی عەرەبی (ش) بەکاردەهێنن وەکوو ئاماژە بە (شی و) (شتێك)، ئەویش ئەو پیتە بوو کە مسولّمانەکان لە نووســـینی زانســـتی بیرکـاری وەکوو ئـامـاژە بە بڕێکی نەزانراو دەیاننووســی، لەبەر ئەوەی زمانی ئیسپانی هیچ دەنگێکی تێدا نییە بەرانبەر پیتی (ش) (Sh)، ئیســـپانییەکان ئەو پیتەیان لە زمانی یۆنانی هێنا و ئەو پیتە یۆنانییەش بەم شـێوەیە دەنووســـرا (X)، کە شـــێوەکەی نزیکە لە پیتی لاتینیی ئێکس (X)، لێرەوە بەکارهێنانی ئەم پیتە بۆ ئاماژەدان بە شتێکی نادیار دەستی پێ کرد.



- عبدالعزیز گوتی: کەواتە ڕێك کەوتین ئەو پیتە ئاماژەیە بۆ نادیار، ئەی پیتەکانی تری سەر پەڕەکە؟

- ئەوە هەمان ئەو شـــتەیە کە دەمانەوێت لە پایتەختی مێش و مەگەز لەندەن بیزانین!

#ماڵئاوا کاترین

نیزال لە ماوەی خوێندنی زانکۆیدا یەکێک بوو لە قوتابییەکانی پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، ئەو خولیای بابەتی مێژووی ئایینەکان بوو کە ئەو مێژووزانە ئینگلیزییە گەورەیە بابەتەکەی دەوتەوە، پرۆفیسۆر بە شێوازە سادەکەی لە گەیاندنی زانیارییە مێژووییەکان بە قوتابییانی زانکۆ دەناسرایەوە، بەشێوەیەک وای لە نیزال کرد بابەتی نامەی ماجستێرەکەی بکاتە (شفرە لە ئایینەکان)، زۆر خۆشحاڵ بوو کاتێک پرۆفیسۆر تکاکەی قبووڵ کرد بۆ ئەوەی ببێتە سەرپەرشتیاری لێکۆڵینەوەکەی، سەرەڕای ئەوەی هەموان دەیانزانی پرۆفیسۆر سەرپەرشتیاری هیچ نامەیەکی زانستی قبووڵ ناکات کەمتربێت لە پلەی پرۆفیسۆری لە زانکۆی ئۆکسفۆرد، بە تێپەڕبوونی کات پەیوەندیی نێوانیان زیاتر بوو لە پەیوەندیی نێوان مامۆستا و قوتابی و زیاتر لە پەیوەندیی باوک و کوڕ دەچوو، لە زۆرێك لە بۆنەکان پرۆفیسۆر بریستلی میوانداریی نیزالی دەکرد بۆ کۆشکە کۆنەکەی لە دەوروبەری لەندەن و، نیزال پەرتووک و دەستنووسە مێژووییە کۆنەکانی دەخوێندەوە و دەربارەی بابەتە مێژووییەکان گفتوگۆیان دەکرد، هەر لەوێش نیزال بە کاترین ئاشنا بوو کە لە گفتوگۆکانیان بەشداریی دەکرد سەرەڕای ئەوەی کاترین زانستە سیاسی و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی دەخوێند لە زانکۆی کامبریج، لە یەکەم بینینیان پەیوەندیی خۆشەویستی لەنێوان نیزال و کاترین دروست بوو، بەڵام هەردوولا هەستەکانیان دەشاردەوە، ڕۆژ

دوای ڕۆژ هەستەکانیان بەرانبەر یەکتری زیادی دەکرد، تاوەکوو ئەو ڕۆژە هات و هەردوولا هەستەکانیان بۆ یەکتری ئاشکرا کرد، نیزال ڕاستەوخۆ داوای هاوسەرگیری لە کاترین کرد و، کاترینیش ڕازی بوو، بۆیە چەند ڕۆژ دواتر نیزال خوازبێنیی کرد لای باوکی، بەڵام پرۆفیسۆر بیرۆکەی هاوسەرگیریی کچەکەی و نیزالی بەتەواوی ڕەت کردەوە، بە بەهانەی ئەوەی هەریەکەیان سەر بە کەلتوورێکی جیاوازن و، هەوڵی دا باوەڕیان پێبهێنێت کە ئەو جۆرە هاوسەرگیرییە سەرکەوتوو نابێت، بەتایبەت دوای لەدایکبوونی منداڵ و دەرکەوتنی جیاوازیی کەلتووری دایبابان لە هەڵبژاردنی باشترین ڕێگای پەروەردەکردنیان، بەڵام نیزال و کاترین بەم بەهانەیە ڕازی نەبوون و باوەڕیان نەهات، بەڵکوو زیاتر پەیوەستی یەکتری بوون، ئەمەش وای لە پرۆفیسۆر کرد ڕاستەوخۆ هۆکاری ڕازینەبوونی بە نیزال بڵێت:

- باش گوێم لێبگرە نیزال، تۆ باش دەزانی چەندە بەڕێز و خۆشەویستیی لام، هەروەها دەشزانی کە من دوورترین کەسم لە ڕەگەزپەرستی، ئەگەر بەڕاستی کاترینت خۆشدەوێت لێی دووربکەوە!
- بەڵام بۆچی گەورەم؟ شتێکت لە من بینیوە کە لە ژیانی کچەکەت بترسی لە من؟!
- باشە، هەوڵدەدەم لەگەڵت ڕاشکاوبم، هیوادارم بە هەڵە لە قسەکانم تێنەگەیت، من تەنیا واقیعی ئەو ژیانەت بۆ باس دەکەم کە تیایداین، نەك ئەو دونیا خەیاڵییەی کە تۆ و کچەکەم دەتانەوێت تێیدا بژین، وەکوو دەزانی کاترین تەنیا وەرزێکی ماوە تاوەکوو بەشی زانستە

سیاسییەکان و پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانی زانکۆی کامبریج تەواو بکات، شوێنێکی ڕاهێنانم بۆ دۆزیوەتەوە لە یەکێک لە کۆنسولخانەکانمان.

- ڕاستە پێش مانگێك کاترین بۆی باسکردم، ئەو کاتە پێم گوت من ئامادەم ڕێکەوتی هاوسەرگیرییەکەمان پێشبخەم بۆ ئەوەی بەیەکەوە گەشت بکەین تاوەکوو تەواوبوونی ماوەی ڕاهێنانەکەی.

- ئایە پێشی گوتی بەم دواییانە کونسولخانە نامەیەکی بۆ ناردووە و داوای لێبوردنی لێ کردووە لە وەرگرتنی لە کونسولخانە لەبەر هۆکاری ئەمنی؟!

- چی؟ بەڕاستی ئەوە ڕوویداوە؟! نا هەرگیز ئەوەی پێنەگوتووم!

- لەوانەیە نەیویستبێت هەستەکانت بریندار بکات، گومانی تێدا نییە کە بڵاوبوونەوەی هەواڵی هاوسەرگیرییەکەتان هۆکاری وەرنەگرتنی بووە لە کونسولخانە، خۆت ئاگاداریی ئەو پاڵەپەستۆیەی کە حیزبەکان و بزوتنەوە ڕاسترەوەکان دەیخەنە سەر حوکمەت دەربارەی بابەتی کۆچکردن بەگشتی و کۆچی مسوڵمانان بەتایبەتی، بەتایبەت دوای تەقینەوە تیرۆریستییەکانی ئەم دواییەی لەندەن، پەیوەندیی هەر کچێکی ئینگلیزیش کە بیەوێت لە بواری دیبلۆماسیی بەریتانی کار بکات بە گەنجێکی مسوڵمان بەتایبەت لەم کاتەدا بەداخەوە بە واتای کۆتاییی کارەکەی دێت، پێش ئەوەی دەست پێ بکات، تەنانەت ئەگەر ئەو کچەش کچی بنەماڵەی بریستلی بێت، ئەو بنەماڵە

ئۆرۆستۆکراتییەی کە ڕۆڵەکانی چەندین پلەی باڵایان وەرگرتووە لە حکومەتی بەریتانی.

- نیزال بەدەنگێکی پڕتاسەوە گوتی: بەدیاریکراوی دەتەوێت بڵێیت چی مامۆستا؟

- نیزال، کاترین زۆر بەتۆوە پەیوەستە، پێم وایە ئامادەیە قوربانی بە ئایندەی کارەکەی بدات لەپێناو تۆ، تکات لێدەکەم، ئەگەر بەڕاستی ئەوت خۆشدەوێت، بەیەکجاری لە ژیانی بچۆرە دەرەوە، بهێڵە ژیانی خۆی بکات!

دوای ئەوەی نیزال ئەو قسانەی لە باوکی کاترین بیست، یەکسەر دەرچوو لای پرۆفیسۆر و چاوەکانی پڕ بوون لە فرمێسك، پاشان خۆی کۆنترۆڵ کرد و تەلەفۆنەکەی هەڵ گرت، هەوڵی دا تۆنەکانی دەنگی بشارێتەوە و پەیوەندیی بە کاترینەوە کرد، پێی ڕاگەیاند پەشیمان بووەتەوە لە هاوسەرگیریکردن لەگەڵی، پاشان بەخێرایی کۆتایی بە پەیوەندییەکە هێنا و گوتی: (ماڵئاوا کاترین)، دواتر تەلەفۆنەکەی داخست و لەنێو باخچەکان هاتوچۆی دەکرد، بەبێ ئەوەی هەست بە قاچەکانی بکات، نیزال لە کاتی ڕۆیشتن لە دیمەنی خۆرئاوابوون ڕاما بوو کە ڕووناکییەکەی تیشکی دەدایەوە بەسەر فرمێسکی چاوەکانیدا کە وەکوو بارانی بەهار دای دەکرد.

# لەبەردەم دەرگای کۆشك

نیزال و عبدالعزیز لە کاتێکی درەنگی شەو گەیشتنە بەردەم کۆشکەکەی پرۆفیسۆر بریستلی، ئاسمان هەور بوو، مێشیش جێگاکەی پڕ کردبوو ئەمەش ئەو شوێنەی ترسناکتر پیشان دەدا، کاتێك دوو هاوڕێکە گەیشتنە بەردەم دەرگای کۆشك، عبدالعزیز تێبینیی گۆڕانی ڕووخساری نیزالی کرد، دەستی خستە سەر شانی و پێی گوت:

- ئێستاش دەتوانین بگەڕێینەوە، دەتوانین کاتێکی تر پرۆفیسۆر ببینین!

- کێشە نییە عبدالعزیز، هەمووشتێك باشە، تەنیا کۆتا جارم بیرکەوتەوە کە سەردانی ئەم کۆشکە ساردەم کرد!

- عبدالعزیز پرسیی: تا ئێستاش لە پرۆفیسۆر تووڕەی بەهۆی ئەوەی درۆی لەگەڵ کردی تاوەکوو واز لە کچەکەی بهێنی؟

- لەو تووڕە نیم، ئەو تەنیا باوکێکە کە لە ئایندەی کچەکەی دەترسێت بۆیە بەگەمژەیی هەڵسوکەوتی کرد. لە سەرەتاوە دەمزانی ئەو چیرۆکەی هەڵبەستووە تاوەکوو لە یەکتریمان دووربخاتەوە، بەڵام نەمویست لەپێناو من ڕووبەڕووی باوکی و کۆمەڵگاکەی ببێتەوە، بۆیە پێم باشتر بوو لە ژیانی بکشێمەوە، لە ڕاستیدا من لە خۆم تووڕەم، کاترین شایەنی زۆر لەوە زیاتر بوو کە تەنیا بە تەلەفۆنێك کۆتایی عیشقەکەمانی پێ ڕابگەیەنم!

- ڕاست دەکەی نیزال، کاترین کچێکی ئارام و لەسەرەخۆ بوو، بەتەواوی تێکشکابوو کاتێك هاتە لام تاوەکوو هۆکاری وازهێنانت و وەڵامنەدانەوەی تەلەفۆن و نامەکانی بزانێت، بەڵام پێت گوتم کە پێی نەڵێم باوکی چیی کردووە بۆ ئەوەی پەیوەندیی نێوانیان تێك نەچێت، بۆیە منیش پێم نەگوت، نیزال ئێستا هیچ هەواڵێکی دەزانی؟

- لەدوورەوە گوێبیستی هەواڵەکانی دەبم، زۆر دڵخۆش دەبم کاتێك بەردەوام سەرکەوتنەکانی لە بوارە زانستییەکەیدا دەبینم، بەم دواییانە بیستم لە شاری لیۆنی فەڕەنسی دەژی دوای وەرگرتنی پلەیەکی باڵا لە پۆلیسی نێودەوڵەتیی (ئینتەرپوڵ).

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە بیستووتە کە مسوڵمان بووە و بە جلی حیجابەوە کارەکانی لە ئینتەرپوڵ دەکات؟

- بەڵی، بیستوومە، زۆر دڵخۆش بووم بەوە، باوکی لە کۆمەڵێك خەیاڵی ناو سەری دەترسا، وایدەزانی هاوسەرگیریی کچەکەی لە گەنجێکی مسوڵمان بەربەست دەخاتە بەردەم ژیانی زانستی، ئەوا ئێستا کچەکەی مسوڵمان بووە و بە جلی ئیسلامییەوە بەشێوەیەکی ئاسایی لە گەورەترین ڕێکخراوی ئەمنی لە جیهان کارەکانی دەکات بەبێ هیچ بەربەستێك. بەهەرحاڵ کاترین کچێکی باشە و هیوای باشترینی بۆ دەخوازم، با ئێستا واز لە یادگارییە کۆنەکان بهێنین و بیر لەوە بکەینەوە کە لەپێناوی هاتووین، پرسیاری زۆر هەیە دەبێت پرۆفیسۆر بریستلی بۆمانی ڕوون بکاتەوە.

- پێت وایە مامۆستاکەت بتوانێت ئەو لێڵییە لابدات؟

- نیزال وەڵامی دایەوە: هیواخوازم هاوڕێ بتوانێت ئەو کارە بکات.

دوای ئەوە نیزال و عبدالعزیز لە دەرگای کۆشکەکە چونە ژوورەوە کە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی کرایەوە، پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی لە کاتی دیاریکراو لە هۆڵی کۆشکەکە لە پێشوازییان بوو.

# چەتەکانی قدیس یۆحەننا

نیزال منداڵێکی نازدار بوو، کاتێك تەمەنی سێ ساڵان بوو باوکی لەدەست دابوو، گرووپێکی نهێنی سەر بە ((چەتەکانی قدیس یۆحەننا)) کوشتیان وەکوو ئاگادارکردنەوەی یەکەم بۆ دایکی کە ڕازی نەبوو هاوکارییان بکات و واز لە لێکۆڵینەوە مێژووییەکەی بهێنێت کە ئەو چەتانە نەیاندەویست ئەو زانیارییانە بۆ خەڵکی ئاشکرا ببێت، بەڵام دایکی ئامادە نەبوو خۆی بداتە دەستی ئەو بکوژانە، لەجیاتیی ئەوە بڕیاری دا تۆڵەی هاوسەرەکەی لە سەرکردەکانی ئەو دەستەیە بکاتەوە، لەڕێگەی ئاشکراکردنی ئەو ڕاستییە مێژووییانەی ئەو کۆمەڵە خراپە دەیانویست لە مرۆڤایەتی بشارنەوە، بۆیە کۆپییەك لە دەرئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی بۆ ئەو گرووپە نارد دوای ئەوەی زانیارییە گرنگەکانی شاردەوە و گۆڕینی بە کۆمەڵێك زانیاریی هەڵە، لە بەرانبەردا بڕێکی زۆر پارەی بەدەست هێنا بۆ ئەوەی لە جەنگەکەی لە دژیان بەکاری بهێنێت و باوەڕیان پێبهێنێت کە تەسلیمی فریودانەکانیان بووە، بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەی بەنهێنی تەواو بکات. لەترسیی ئەوەی زەرەرێك بە نیزال نەگات، بڕیاری دا گەشت بکات بۆ دەرەوەی فەلەستین و نیزال لای پوورە خەدیجەی جێبهێڵێت کە ئاگاداری تەواوی پلانەکە بوو، دوای چەند مانگێك لە گەشتەکەی دایکی و پووری هەواڵێکیان هەڵبەست دەربارەی کۆچی دوایی دایکی و، داوای لێکرد ئەم هەواڵە لە هەمووشوێنێك بڵاو بکاتەوە، هیچ کەسێکیش بەوە نەزانێت کە ئەو زیندووە و نەمردووە،

بۆیە لەڕێگـای هێڵێکی تەلەفۆنیی ئەمنییەوە جـار جـارە دایکی پەیوەندیی بە پوورییەوە دەکرد تاوەکوو لە سەلامەتیی نیزال دڵنیاببێتەوە و هەواڵی بپرسێت، لەگەڵ پوورە خەدیجەدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بەشـداریی پەروەردەکردنی دەکرد، تەنانەت زۆربەی ئەو شـیفرانەی کە پووری ڕاهێنانی پێدەکرد لەسەری لەمنداڵیدا ئەو دەینارد.

چەتەکانی قدیس یۆحەنناش کە ناویان لەخۆیان نابوو (سـوارچاکانی قـدیس یۆحەننـا - Knights of saint john)، گرووپێکی تیرۆریسـتیی زۆر ترسـناك بوون لە ترسـناکترین چەتەکانی دەریای سـپیی ناوەڕاسـت، ئەو چەتانە هەڵدەسـتان بە کاری چەتەیی دژی کەشـتییە بازرگانییەکان، بەتایبەت کەشـتیی بازرگانە مسـوڵمانەکان، سـەرەتای گەشـەکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ جەنگەکانی خاچپەرستی لە فەلەسـتین، ئەو کات پێیان دەوترا (سـوارچاکانی هۆسـپیتالییە - Knights Hospitaller)، لە میانەی جەنگی خاچییەکان بە توندڕەوی و ڕقی زۆریان لە ئیسـلام و مسـوڵمانان ناسـراوبوون، هەسـتان بە ئەنجامدانی کۆمەڵێك کۆمەڵکوژیی گەورە دژی مسـوڵمانان لە فەلەسـتین، تاوەکوو سـەرکردەی کوردی مسـوڵمان (سـەلاحەدینی ئەیوبی) ئەو خـاکەی لێیـان پـاك کردەوە، دوای دەرکردنیان چوونە دوورگەی ڕۆدس لە دەریای سـپیی ناوەڕاسـت و، کردیانە بنکەی ئەنجامدانی کردەوەکانیان لە دەریای سپیی ناوەڕاست، بەم شـێوەیە بوونە مەترسـییەکی ڕاسـتەقینە لەسـەر بازرگانیی نێودەوڵەتی لە دەریای سپی، چەندین کۆمەڵکوژییان دژی مسوڵمانان

ئەنجام دا، تاوەکوو سـولْتانی گەورەی عوسـمانی سـولْتان سـلێمانی قانوونی بڕیاری دا سـنوورێك بۆ تاوانەکانیان لە دژی مرۆڤایەتی دیاری بکات، بۆیە سـولْتان خۆی سـەرکردایەتیی کەشـتیگەلێکی گەورەی ئیسـلامی کرد بەرەو ڕۆدس، چەتەکانی قدیس یۆحەننا خۆیان لەناوەوەی قەڵاکەیان قایم کرد، هێزی تۆپهاوێژی ئیسـلامی قەڵاکانی بۆردومان دەکردن، بەڵام بێسـوود بوو، کاتێك مسـوڵمانان نەیانتوانی لە قەڵا بەرزەکانیان سـەربکەون، سـولْتان بڕیاری دا لەژێر زەوییەوە بۆیان بڕوات، خەلیفەی عوسـمانی بڕیاری دا بە هەڵکەندنی پەنجا خەندەق لەژێر دیوارەکانی قەڵای مەحکەمی ڕۆدس، بۆ ئەوەی هێزی تایبەتی سـەر بە هێزی خەلافەتی ئیسـلامی لەڕێیەوە بگاتە دڵی دوژمن، مینی چێندراویان لەژێر قەڵاکە دانا، چەتەکان لەناکاو بینییان زەوی لەژێریان دەلەرزێت، پاشـان هێزی ئیسـلامی لەژێر زەوییەوە بۆیان دەرچوون، بۆیە چەتەکان بڕیاریان دا خۆبەدەستەوە بدەن و سولْتان ئەمانی پێبەخشین بەرانبەر چۆڵکردنی تەواوەتی دوورگەی ڕۆدس، دوای ئەوە ئەم دوورگەیە بووە بنکەیەکی سەربازی بۆ هێزی دەریاییی عوسمانی بۆ سەدان ساڵ.

دوای دەرکردنیان لەسـەردەسـتی قانونی، چەتەکانی قدیس یۆحەننا کۆچیـان کرد بۆ مـاڵتـا و کردیـانە بنکەی خۆیـان، لەو کـاتەوە بە (سـوارچاکانی ماڵتا - Knights of Malta) ناسـران، لەم ڕێکەوتەوە ماڵتا بووە بنکەی دەرچوونی کردەوەی تیرۆریسـتی دژی کەشتیی مسوڵمانان و مەسیحییەکان، تاوەکوو سەرکردەی فەڕەنسی

ناپلیۆن پۆناپارت بڕیاری دا بەیەکجاری لەناویان ببات و بەسەریاندا سەربکەوێت لە ساڵی ١٧٩٨ز، سەرەڕای پەرتەوازەبوونیان لە ئەوروپا، بەڵام بوونیان هەر مایەوە بەشێوەی ڕێکخراو لەژێر ناوی کاری خێرخوازی، بۆیە هەستان بە دامەزراندنی (ڕێکخراوی سوارچاکانی ماڵتا) کە دەوڵەتێکی گریمانەییە و تا ئێستا نزیکەی ١٠٠ وڵات دانیان پێ داناوە و، پەیوەندیی تووندوتۆڵیان لەگەڵ (سوارچاکانی پەرستگا - Knights Templar) هەیە، کە ئێستا کاریگەرییەکی سیاسیی گەورەیان هەیە لە جیهاندا، چەندین ڕاپۆرت ئاماژە بەوە دەکەن کە یەکێك لە گەورەترین کۆمپانیا بەکرێگیراوەکان لە جیهاندا ڕووکاریی نوێی سوارچاکانی ماڵتای خاچپەرستین.

# ئاریۆس




پڕۆفیسۆر لەسەر کورسیی کتێبخانەکەی دانیشتبوو گوێی لە نیزال دەگرت کە باسی ناواخنی ئەو لێکۆڵینەوەیەی دەکرد کە بەدەستیەوە بوو، پڕۆفیسۆر هەندێك بەڵگەنامەی نووسراو بە زمانی ئینگلیزی هەڵدەدایەوە کە هاوپێچی لێکۆڵینەوەکە بوون کە بە زمانی عەرەبی نووسرا بوو، پاشان پڕۆفیسۆر لەسەر کورسییەکەی هەستا و بە دەنگێکی پڕسۆزەوە هاواری کرد:

سەرنجڕاکێشە! ئەم لێکۆڵینەوەیە سەرنجڕاکێشە!دایکت زانیاریی گرنگی دەربارەی ئاریسییەکان دەست کەوتووە، هاوپێچ لەگەڵ لێکۆڵینەوەکەدا کۆمەڵێك بەڵگەنامەی ترسناکی داناوە کە چەتەکانی قدیس یۆحەننا تۆمەتبار دەکات بە شاردنەوەی مێژووی ئاریسییەکان، ئەوەش دووپات دەکاتەوە کە دەربارەیان بڵاوبووەتەوە بەوەی ئەوان تەنیا کەسانێکی بکوژن کە خۆیان بە بەرگی ئایین داپۆشیوە، ئەم

لێکۆڵینەوەیە بۆی هەیە ڕووناکی بخاتە سەر مێژووی ونی ئاریسییەکان، کە سەدان ساڵە لە مرۆڤایەتی شاردراوەتەوە!

- عبدالعزیز پرسیی: ڕووناکی خستنە سەر مێژووی ونی ئاریسییەکان؟! سەدان ساڵە لە مرۆڤایەتی ونە؟!

پرۆفیسۆر ڕووی کردە عبدالعزیز و بەسەرسوڕمانەوە سەیری دەکرد وەك ئەوەی یەکەمین جار بێت بیبینێت، سەرەڕای ئەوەی نیزال لە دالآنەکە بە یەکتری ناساندن، نیزال پێکەنیی و بە پرۆفیسۆری گوت:

- عبدالعزیزی هاوڕێم زۆر پەرۆشی بینینت بوو پرۆفیسۆر، پێم ڕاگەیاند بوو تۆ باشترین کەسی کە مێژووی ونی ئاریسییەکانی بۆ باس بکەیت، هەر بەم بۆنەیەوە پرۆفیسۆر ئەو خەڵکی باکووری ئەفریقایە و دایکیشی ئەمازیغییە، بەتەواوی وەکوو ئاریۆس.

- عبدالعزیز پرسیی: چیی؟ ئایە ئاریۆس ئەمازیغی بووە؟!

پرۆفیسۆر چوو بەرەو نەخشە گەورەکەی جیهان کە لەلایەکی کتێبخانەکە هەڵواسرا بوو، ئاماژەی بۆ ناوچەیەکی ڕۆژهەلآتی لیبیا کرد و بە عبدالعزیزی گوت:

- (ئاریۆس- Arius) قەشەیەکی بەڕەسەن ئەمازیغی بوو لە باکووری ئەفریقا، لە لیبیا لە دایك بووە و لە میسر ژیاوە، ساڵی ٢٥٦ز لە شاری (قورینا) لە ڕۆژهەلآتی لیبیا لە دایك بووە، ژیانی لە شاری ئیسکەندەرییەی میسری بەسەر بردووە و قەشەی یەکێك لە کەنیسەکانی بووە، لە شاری ئەنتاکییە لە باکووری شام لەسەر دەستی

یەکێك لە گەورەترین کەسایەتییەکانی مێژووی مەسیحییەت خوێندوویەتی، ئەویش قەشەی سووری (لوسیانی ئەنتاکی - Lucian of Antioch) بوو، کە مەسیحییەکانی ئێستا پێی دەڵێن، (سەینت لوسیان - Saint Lucian) واتە قەشە لوسیان، هەروەها پێشی دەڵێن، (لوسیانی شەهید - Lucian the Martyr).



- عبدالعزیز پرسیی: بۆچی نازناوی شەهیدیان بەخشیوەتە مامۆستاکەی ئاریۆس لوسیانی ئەنتاکی؟

- نیزال گوتی: لەبەر ئەوەی بەهۆی ئیمانەکەیەوە لەلایەن ئیمپراتۆری بتپەرستی ڕۆمانی (ماکسیمیان - Maximian) شەهید کرا، ئەو کاتە زۆربەی ناوچە مەسیحییەکان کەوتبوونە ژێر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی کە ئەو کاتە بتپەرستی ئایینی ڕەسمیی دەوڵەت بوو.



دراوێك كە وێنەی ماكسیمیانی لەسەرە

- عبدالعزیز گوتی: كەواتە ئاریۆس قوتابی یەكێك لە گەورەترین زانا یەكەمینەكانی مەسیحییەت بووە، كە گیانی لەپێناوی ئیمانەكەی بەخت كردووە، بەدڵنیاییەوە دەبێت پیاوانی كەنیسە ڕێزێكی زۆر لە ئاریۆس بگرن.

- دوای بیستنی ئەم قسەیە نیزال و پرۆفیسۆر بەزەردەخەنەوە سەیری یەكتریان كرد.

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: شتێكم باس كردووە شیاوی پێكەنین بێت؟!

پرۆفیسۆر بریستلی گوتی: وەرە عبدالعزیز، دەمەوێت هەندێك وێنەت پیشان بدەم، تاوەكوو ئاستی ڕێزگرتنی پیاوانی كەنیسە لە ئاریۆس بزانی.

پرۆفیسۆر بریستلی هەندێك پەرتووكی كۆنی لە كتێبخانەكەی دەرهێنا و ئاماژەی بە هەندێك وێنەی ناو پەرتووكەكان كرد و بە عبدالعزیزی گوت:

- سەیری ئەم وێنانە بکە، ئەو کەسە دەبینی کە وێنەکەی بەبێڕێزی لەژێر پێی پیاوانی کەنیسەیە، ئەو کەسە ئاریۆسە وەکوو کەنیسە دەیەوێت پیشانی بدات، ئەگەر سەیری ئەو نووسینانە بکەیت، کە هەندێك جار لە لاکانی وێنەکە نووسراوە، ئەوە ناوی ئاریۆسە هەندێك جار بە پیتی لاتینی و هەندێك جاریش بە پیتی یۆنانی، ئاریۆس تا ئێستاش دوژمنی یەکەمی پیاوانی کەنیسەیە، بۆیە بەدرێژایی مێژوو هەوڵیان داوە لە ئەدەبیات و وێنەکانیان بە خراپترین شێوە پیشانی بدەن و لە ڕێزی کەم بکەنەوە لەبەرچاوی جەماوەری مەسیحی، بۆ ئەوەی خەڵکە مەسیحییە سادەکە لەم پیاوە بترسن و لێکۆڵینەوە لە ژیانی و ڕاستیی بانگەوازەکەی نەکەن.



- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام بۆچی هێندە ڕقیان لە ئاریۆسە؟ چی وای لە کەنیسە کردووە بەم شێوە پڕسوکایەتییە لە هەموو وێنەکانیان وێنەی ئەم قەشە ئەمازیغییە بکێشن؟

- پڕۆفیسۆر بریستلی وەڵامی دایەوە: وەڵامەکەی زۆر بەسادەیی ئەوەیە، ئاریۆس ڕووبەڕووی هاوپەیمانیەتیی ڕۆمانە بتپەرستەکان و هەندێك لە پیاوانی کەنیسە وەستایەوە کە بڕیاریان دابوو بەفەرمی مەسیح بکەنە خودا لە سەرەتای سەدەی چوارەمی زایینی.

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە گوتی: سەدەی چوارەمی زایینی! کەواتە ئیمانی مەسیحییەکان سێ سەدە پێش ئەو مێژووە چۆن بوو؟

نیزال سەیری چاوەکانی مامۆستاکەی پڕۆفیسۆر بریستلی کرد وەکوو ئەوەی بیەوێت ئیجازەی قسەکردنی لێوەربگرێت و، پڕۆفیسۆریش سەری جوڵاند وەکوو ئاماژەی ڕازیبوون.

- دوای مەسیح و تاوەکوو بەستنی کۆنگرەی نیقییە لە بیستەکانی سەدەی چوارەمی زایینی، زۆرینەی مەسیحییەکان مەسیحیان بە خودا ئەژمار نەدەکرد، ڕاستە هەندێك کەس زیادەڕەوییان لە توانا و سیفەتەکانی دەکرد و سیفاتی ئەفسانەیان دەدایە پاڵی، بەڵام زۆر کەم بوون ئەوانەی بە خودایان ئەژمار دەکرد، ڕاستەوخۆ دوای مەسیح و لە سەدەی یەکەمی زایینی بزوتنەوەی (هەژارەکان) دەرکەوتن، کە لە مێژووودا بە (ئیبیۆنییەکان - Ebionites)

ناسراون. ئەم وشەیە لە وشەی عیبری (ئیبیۆنیم)ەوە وەرگیراوە کە بە مانای هەژار، یان بێ دەرەتان دێت، ئەو گرووپە دەستەیەك بوون لە بەنی ئیسرائیل کە باوەڕیان بە عیسا هەبوو، باوەڕیان وابوو کە مەسیحی چاوەڕوانکراوی جولەکەکانە و خوایەتییان ڕەتدەکردەوە، واتە ئەوان کەسانێکی یەکتاپەرست بوون، بۆیە هەندێك لە مێژوونووسان پێیان دەڵێن (جولەکە مەسیحییەکان - Jewish Christian)، شوێنکەوتووانی ئەم دەستەیە پێیان وابوو (پۆڵسی نێردراو - Paul the Apostle) کەسێکی هەڵگەڕاوەیە لە ئایینی مەسیحییەت، هەروەها لە سەدەی دووەمی زایینی (تیۆدۆتسی بێزەنتی - Theodotus of Byzantium) و شوێنکەوتوانی دەرکەوتن، ئەمانەش کەسانێکی یەکتاپەرست بوون و، باوەڕیان بە بیرۆکەی خوایەتیی مەسیح نەبوو، پاشان لە سەدەی سێیەمی زایینی گەورە قەشەی بەناوبانگی ئەنتاکیا (پۆڵسی شمشاتی - Paul of Samosata) دەرکەوت، بەم بۆنەیەوە لەو کاتەدا ئەنتاکیا پایتەختی ئایینی مەسیحییەکان بوو، بۆیە ئەو کەسەی سەرۆکایەتیی قەشەکانی ئەو شارەی دەکرد پایەیەکی گەورەی هەبوو لەنێو مەسیحییەکان، بەسە بزانی پۆڵسی شمشاتی یەکێك بوو لە یەکتاپەرستەکان و دژی بیرۆکەی بەخوداکردنی مەسیح بوو، ئەم قەشە گەورەیە لە سایەی شاژنی مەزنی تدمر (زینۆبیا) (Zenobia Queen of Palmyra) دەژیا، ئاشکرایە

شـاژنە زینۆبیا کە ئەم قەشــە یەکتاپەرســتەی دەپاراســت ئەویش لە یەکتاپەرستەکان بوو.

- هەرگیز پێم وانەبووە کە زینۆبیا شـاژنی تدمر یەکتاپەرسـت بووبێت!بەڵام پۆڵسی شمشاتی چیی بەسەرهات دوای شکستهێنانی ئەو شاژنەی دەیپاراست؟ عبدالعزیز پرسیاری کرد.

- بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی بتپەرسـت دەســـتوەردانی کرد لە لادانی قەشـــەیەکی مەســـیحی، ئیمپراتۆری بتپەرستی ڕۆمانی (ئۆریلیان - Aurelian) هەستا بەلادانی ئەم قەشە مەسیحییە، لەسەر داوای قەشەی چەند کەنیسەیەکی ڕۆما کە دژی مەزهەبە یەکتاپەرســـتەکەی بوون، ئەمـانە پێیـان وابوو ئەو قەشەیەکی بێ باوەڕو و دەرچووە لە ڕێنمایەکانی مەسیح.



ئیمپڕاتۆری ڕۆمانی ئۆریلیان

- عبدالعزیز پرسـیی: ئایە بیرۆکە یەکتاپەرسـتییەکەی پۆڵسـی شمشاتی دوای لادانی لەناو چوو؟

- هەرگیز، هاورێ، بیرۆکەکان دوای مردنی خاوەنەکەیان نامرن، بەتایبەت ئەگەر خاوەنی بیرۆکەکە قوتابیی دڵسۆزی وەکوو لوسیانی ئەنتاکی هەبێت.

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: چی؟! لوسیانی ئەنتاکی کە کەنیسە بەیەکێك لە قەشەکانی دادەنێت قوتابیی ئەم قەشە یەکتاپەرستەیە کە هەمان کەنیسە بە بێباوەڕی دادەنێت؟!

- ئاریۆسیش کە کەنیسە بە کەسێکی بێباوەڕی دەداتە قەڵەم یەکێك بوو لە قوتابییەکانی ئەم قەشەیە کە کەنیسە پێی دەڵێت لوسیانی شەهید! ئایە هیچ شتێك لەم هاوکێشەیە تێگەیشتی؟ !پرۆفیسۆر بریستلی بەهەڵچوونەوە پرسیاری کرد.

- عبدالعزیز دووبارە پرسیاری کرد: بەڵام ئاریۆس چیی کردووە کە بەم شێوە شەڕانگێزییەوە کەنیسە بەدرێژاییی مێژوو دژایەتی دەکات.

- عبدالعزیز، ئایە ڕۆمانەکەی نووسەری ئەمریکی (دان براون) (شیفرەکەی داڤینشی -The Da Vinci Code)ت خوێندووەتەوە؟

- نەخێر، پرۆفیسۆر، بەڵام ناویم بیستووە.

- ئایە کاردانەوەی کەنیسە دەزانی دەربارەی ئەم ڕۆمانە؟

- گوێم لێبووە کە ڤاتیکان ڕەخنەی لێگرتوە و داوای لە مەسیحییە باوەڕدارەکان کردووە نەیخوێننەوە، لەبەر ئەوەی ڕۆمانەکە

وا پیشان دەدات کە مەسیح هاوسەرگیریی کردووە لەگەڵ ئافرەتێك و منداڵی لێی بووە.

پرۆفیسۆر زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانەی کرد و گوتی:

- پیاوانی ڤاتیکان دەیانەوێت خەڵکی وا تێبگەیەنن، بەڵام ڕەخنەی کەنیسەی کاسۆلیکی لە شیفرەکەی داڤینشی لەبەر هۆکارێکی زۆر گەورەترە، دان براون لە ڕۆمانە بەناوبانگەکەی شیفرەکەی داڤینشی زۆر بەزیرەکی ئەو مێژووەی ئاشکرا کردووە کە ڤاتیکان بۆ ماوەی سەدان ساڵ لە خەڵکە سادە کاسۆلیکەکەی شاردووەتەوە. پیاوانی کەنیسەی کاسۆلیکی دەزانن کە ئاشکرابوونی ئەم ڕاستییە سادەیە واتای کۆتاییهاتنی هێزە ترسێنەرەکەیانە کە لە هێزە ئایینییەکەیانەوە وەریان گرتووە، کە زاڵە بەسەر زیاتر لە ملیارێك باوەڕداری کاسۆلیك لە تێکڕای جیهاندا.

- ئەم ڕاستییە چییە؟ عبدالعزیز پرسیاری کرد

- ئەو ڕاستییە سادەیەی کە دان براون لە شیفرەکەی داڤینشی باسی کردووە ئەوەیە، کە مەسیح تەنیا مرۆڤێکە و خودا نییە و، مەسیحییەتی ئێستا تەنیا کۆپییەکی نوێی بتپەرستییە، کە ڕۆمانەکان دایانمەزراندووە!

- ئەو مێژووە کامەیە کە ڤاتیکان بۆ سەدان ساڵە دەیەوێت بیشارێتەوە و دان براون بەزیرەکی لە ڕۆمانەکەی ئاشکرای کردووە؟

- ئەو ڕێکەوتە مێژووی (کۆنگرەی نیقییە - Council of Nicaea)یە، کە هەندێك وردەکاری باسکردووە لە بەشی بیست و پێنجەم لە شیفرەکەی داڤینشی.




- دووبارە گەڕاینەوە بۆ کۆنگرەی نیقییە نیزال، ئایە کاتی ئەوە نەهاتووە کە چیرۆکی ئەم کۆنگرەیە بزانم؟!

نیزال سەیری پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی کرد و پێی گوت:

- پرۆفیســـۆر، بەڵێنم بە هاوڕێکەم داوە کە داوا لە تۆ بکەم چیرۆکی کۆنگرەی نیقییەی بۆ باس بکەی، ئەگەر بفەرموویت و بە شێوازە سادەکەت بۆی باسبکەی وەکوو چۆن بۆ ئێمەت باس دەکرد لە کۆلێژ؟

- بەخۆشـــحاڵییەوە، چیرۆکەکە لە شـــاری ئیســـکەندەرییەی میسری دەستی پێ کرد لە سەرەتای سەدەی چوارەمی زایینی، لەم ماوەیەدا...

- هەرکە پرۆفیسۆر دەستی بە باسکردنی کۆنگری نیقییە کرد، کەسێك لە دەرگای پەرتووکخانەکەی دا و پرۆفیسۆر لە باسەکەی وەستا و سەیری دەرگاکەی دەکرد، دوای ئەوە کەسێکی شەست ساڵان بە پرچێکی سپی، کە جلێکی سەرتاپا ڕەش و دەستکێشی سپی پۆشیبوو هاتە ژوورەوە، وەکوو ڕۆبۆت هەنگاوی دەهاوێشت و پاشان ڕووی کردە پرۆفیسۆر بریستلی و بە دەنگێکی فەرمییەوە گوتی:

- بمبەخشە پرۆفیسۆر لەسەر پچڕاندنتان، بەڵام چایی ئامادەیە لە هۆڵی دانیشتن.

- پرۆفیسۆر گوتی: سوپاس بۆ تۆ بەڕێز واتسۆن، ئێستا دێین بۆ خواردنەوەی چایی.

پاشان پرۆفیسۆر لەسەر کورسییەکەی هەستا و گوتی:

- گەنجەکان پێم وایە قسەکانمان دەربارەی کۆنگرەی نیقییە لە هۆڵی دانیشتن تەواو بکەین لە کاتی خواردنەوەی چاییی ئینگلیزی.

# کۆنگرەی نیقییە



پرۆفیسۆر کوپە چاکەی لەسەر مێزەکەی ژووری دانیشتن هەڵگرت و قوومێکی لێ هەڵمژی، پاشان ڕووی کردە عبدالعزیز و دەستی کرد بە قسەکردن:

- چیرۆکەکە لەگەڵ سەرەتاکانی سەدەی چوارەمی زایینی دەست پێ دەکات، لەو کاتەدا لەسەر سەکۆی شاری ئیسکەندەرییە ململانێیەکی گەورە لەنێوان ئەو دوو گرووپە دەرکەوت، گرووپی یەکەم گەورەی قەشەکانی شاری ئیسکەندەرییە (ئەلیکساندەری یەکەم - Alexander I of alexandria) ڕابەرایەتیی دەکرد. ئەم گرووپە بانگەوازی خوایەتیی مەسیحیان دەکرد، بەڵام گرووپی دووەم، قەشە (ئاریۆس - Arius) سەرکردایەتیی دەکرد، کە قەشەی کەنیسەیەکی بچووک بوو لە ئیسکەندەرییە. ئەم گرووپە دژی بیرۆکەی بەخوادانانی مەسیح بوون، یەکێك لەم یەکتاپەرستانەش (میلوتیوس) بوو کە گەورەی قەشەکانی شاری لیکوپۆلیس بوو کە

ئێستا پێی دەوترێت ئەسیوت، کاتێك ململانێی ئەم دوو گرووپە توند بوو ئاریۆس هەوڵەکانی چڕ کردەوە لە بانگەوازکردنی خەڵکی بەرەو یەکتاپەرستی، بەمەش زۆرێك لە مەسیحییەکان بەپیر بانگەوازە یەکتاپەرستییەکەی ئاریۆسەوە هاتن، ئەم کارەش بووە هۆی بێزارکردنی گەورەی قەشەکانی ئیسکەندەرییە.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام کەسێکی وەکوو ئاریۆس کە قەشەی کەنیسەیەکی بچووك بوو چۆن توانیی ڕووبەڕووی پیاوێکی ئایینی گەورەی وەکوو گەورەی قەشەکانی ئەو کاتەی ئیسکەندەرییە ببێتەوە کە ئەو کات پایتەختی میسر بوو؟

- ئاریۆس توانایەکی باشی هەبوو لە باوەڕپێهێنانی خەڵکی بە بەڵگەکانی، چونکە ئەو قوتابیی مامۆستای گەورەی مەسیحی لوسیانی ئەنتاکی بوو، تێکڕای خەڵکی باوەڕیان بە ڕاستیی و دڵسۆزییەکەی هەبوو بۆ بانگەوازی مەسیح. پڕۆفیسۆر (دیمیتریۆس کۆسۆلاس -Dimitrios Kousoulas) لە پەرتووکەکەی (ژیان و سەردەمی قوستەنتینی گەورە - The life and times of Constantine the Great)دا دەربارەی ئاریۆس دەڵێت: ڕەوانبێژیی و سادەیی و دانیشتنە پڕ هەیبەتەکەی شوێنکەوتەی زۆری بۆ ڕاکێشا، ئەو کەسێکی باڵابەرز و چالاك بوو، هەمیشە جلێکی سپی دەپۆشیی بەبێ .....)، هەروەها دەشڵێت (ئاریۆس لەو پیاوانە نەبوو کە بتوانرێت بەئاسانی بێدەنگ بکرێت، تەنیا کەسیش

نەبوو، کە ئەم بیروباوەڕەی هەبێت، بەڵکوو زۆربەی قەشـــە و پیاوە ئایینییەکانی ڕۆژهەڵات باوەڕیان بە ڕێنماییەکانی هەبوو).




- دوژمنەکانی ئاریۆس چییان کرد بۆ وەســـتاندنی بانگەوازە یەکتاپەرستییەکەی؟ عبدالعزیز پرسیاری کرد.

- دوای ئەوەی بانگەوازی یەکتاپەرســتیی مەســیحییەت بەشـێوەیەکی بەربڵاو بڵاوبوویەوە لە شـاری ئیسـکەندەرییە، گەورەی قەشـەکانی ئەو شـارە ئەلیکسـەندرۆسی یەکەم فەرمانێکی دەرکرد بە دەرکردنی ئاریۆس لە کەنیسە بچووکەکەی. سەرەڕای ئەو شەڕەی کە کەنیســە لە دژی بەرپای کرد ئەم قەشـەیە بەردەوام بوو لە بانگەوازە یەکتاپەرســتییەکەی، بۆیە نامەی بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی خوێندنی نارد ئەو کاتەی قوتابی بوون لای مامۆستاکەیان لوسیانی شەهید و داوای ســـەرخســـتنی پرســـەکەی لێکرد. ئەم هاوڕێیەی ناوی

(یۆسابیۆسی نیقۆمیدی - Eusebius of Nicomedia)
بوو، کە گەورەی قەشەکانی شاری نیقۆمیدیای ئەنادۆڵ بوو، پێشوتریش گەورەی قەشەکانی شاری (بیروتاس) واتە بەیروتی لوبنانی ئێستا بوو، پێش ئەوەی بچێتە نیقومیدیا.




- نیزال گوتی: عبدالعزیز، بەباشی ناوی ئەو پیاوەت لەیادبێت، دەوری باڵای دەبێت لە دروستکردنی ئایندە و، لە پاشان گۆڕینی ڕێڕەوی مێژوو و نەخشەی زەوی.
- پرۆفیسۆر پشتگیریی قسەکانی نیزالی کرد و گوتی: بەتەواوی ڕاستە نیزال، ئەو پیاوێکی بێ وێنە بوو.



- عبدالعزیز پرسـیی: کەواتە وەڵامی یۆسـابیۆس بۆ نامەی ئاریۆسی هاوڕێی چی بوو؟

- ئاریۆس نامەکەی بۆ یۆسابیۆسی هاوڕێی بە وشەیەك دەست پێ کردبوو کە شیاوی بیرلێکردنەوەیە، لە سەرەتای نامەکەی ئاریۆس نووسیبوی: (ئەی قوتابیی لوسیان -Fellow Lucianist)!

- عبـدالعزیز گوت: ئەمە بەو واتـایە دێـت کە ئـاریۆس ویسـتوویەتی ئەوە بیری هـاوڕێکەی بخاتەوە کە لە قوتـابخانەی مامۆستاکەیان لوسیانی شەهید فێری بوون، ئەمەش ئاماژەیە بەوەی لوشـیانی شـەهید کە کەنیسـە بە قەشـەیەکی گەورەی دەداتە قەڵەم لەسەر بیروباوەڕی یەکتاپەرستی بووە و، باوەڕی بە خوایەتیی مەسیح نەبووە، هەروەها واتە ئاریۆس لەسەر هەمان بیروباوەڕی مامۆستاکەی بووە، ئەگینا بۆچی ئەوە بیری هاوڕێکەی یۆسـابیۆس دەخاتەوە کە لەسەردەستی مامۆستاکەیان فێری بوون؟!

- وا دەردەکەوێت، بەتایبەتی کە یۆسـابیۆس دوای خوێندنەوەی نامەی هاوڕێکەی بەئاشـکرا پشـتگیریی خۆی بۆ ئاریۆس دەربڕیووە و، بەرانبەر بیرۆکەی بەخوادانانی مەسـیح کە گەورەی قەشـەکانی ئیسکەندەرییە ئەلیکسەندرۆس بەهێزەوە پشتگیریی دەکرد.

- دوای ئەوە چی ڕوویدا؟ عبدالعزیز بەپەرۆشەوە پرسیارەکەی کرد.

- هەواڵی ئەم ململانێیە گەیشـتە تەواوی کەنیسـەکانی تر، بەمەش تەواوی قوتابییەکانی تری لوسـیانی شـەهید کە بووبوونە

قەشـــەی گەورە پشـــتگیریی خۆیان بۆ بانگەوازی یەکتاپەرســـتی ڕاگەیاند کە ئاریۆس ئاڵاهەڵگری بوو و نامەی پشتگیرییان بۆ نارد، دوای ئەوە کۆمەڵێك قەشەی گەورەی جیهانی مەسیحی پشتگیریی خۆیان بۆ ئەم بانگەوازە ڕاگەیاند.

- عبدالعزیز گوتی: ئەمە واتە ئاریۆس لە جەنگە فیکرییەکەی بەسەر بەخوادانەرانی مەسیح سەرکەوت!

- نیزال گوتی: بە ئەگەری زۆر ئەنجامەکە بەم شـــێوەیە دەبوو ئەگەر جەنگەکە بە جەنگێکی فیکری بمـــایەتەوە و نەبوایەتە جەنگێکی سیاسی!

- ســـیاســـەت چ پەیوەندییەکی بەم جۆرە بابەتە فیکرییانەوە هەیە؟ عبدالعزیز پرسیی.

- پرۆفیسـۆر پرسـیی: عبدالعزیز، کەسـە سـیاسـییەکان زیاتر ئارەزوویان لە چییە؟

- عبـدالعزیز وەڵامی دایەوە: بەدڵنیـاییەوە دەســـەڵات و پاوانخوازی.

- ئافەرین، دەســەڵات و پاوانخوازی، لە مێژوودا هیچ شـــتێك وەکوو ئاین مرۆڤ دەستەمۆ ناکات، هەر بۆیە زۆرێك لە سیاسییەکان بەدرێژاییی مێژوو لە کۆن و نوێدا هەوڵیـان داوە ئـایین بۆ مەرامی خۆیان بەکار بهێنن و پیاوانی ئاینی ملکەچی ویســـتەکانیان بکەن و، پیرۆزیەتی ئایینی بە بڕیارە تایبەتەکانیان بدەن، واتە ئایین بکەنە

هۆکارێك بۆ ئەوەی پشـــتگیریی و یارمەتیی گەلەکانیان بەدەســـت بهێنن.

- عبدالعزیز پرسیی: چۆن لە سەردەمی ئاریۆس ئەمە ڕوویدا؟

- لەو کـاتەدا زۆربەی کەنیســـەکان کەوتبوونە چوارچێوەی ئیمپراتۆریەتیی بێزەنتیی ڕۆمـانی و، ئـایینی فەرمیی ئەم ئیمپراتۆریەتەش بتپەرستیی ڕۆمانی بوو، دوای نزیکەی ٣٠٠ سـاڵ لە لەدایکبوونی مەسیح، ئایینی بتپەرستیی ڕۆمانی خەریکبوو لەناو دەچوو بەرانبەر فراوانبوونی ئایینی مەســیحی، تێکڕای ناوچەکانی دەسەڵاتی ئەم ئیمپراتۆریەتە جەنگی ئایینیی خوێناوی بەخۆوە دیبوو بەدرێژاییی ســەدان ســاڵ لەنێوان مەســیحی و بتپەرســتەکان، بۆیە ئیمپراتۆری ڕۆمانی لەو کاتەدا بیری لە دروســتکردنی تێکەڵەیەکی ئـایینی کردەوە کە گونجـاو بێـت بۆ تەواوی گەلەکـانی ئەم ئیمپراتۆریەتە مەزنە.




- عبـدالعزیز پرســـیی: لەم کـاتەدا کێ ســـەرکردایەتیی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی دەکرد؟

- لەم کاتەدا ئیمپراتۆری ڕۆمانی (قوستەنتینی یەکەم) کە بە (قوستەنتینی گەورە - Constantine the Great) ناسراوە، ئیمپراتۆری ئەم ئیمپراتۆریەتە بوو.




- عبدالعزیز پرسیی: ڕۆڵی ئەم ئیمپراتۆرە ڕۆمانییە چی بوو لەو ململانێ فیکرییەی نێوان مەسیحییەکان لەم کاتەدا؟

- ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە لەو کاتەدا توانی تەواوی ئیمپراتۆریەتەکەی یەك بخات دوای جەنگێکی گەورەی ناوخۆیی، بۆیە ویستی دەسەڵاتەکەی بەسەر تەواوی ئیمپراتۆریەتەکەیدا بکێشێت لەڕێی دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵاتی ئایینی مەسیحی، ئەم کارەش بەوە دەبوو کە ئایینی مەسیحی لابدات لە ڕێگا ڕاستەقینەکەی بەشێوەیەك کە لە بتپەرستیی ڕۆمانی نزیك بێت کە ئیمپراتۆر شوێنکەوتەی بوو، بەتایبەت دوای ئەوەی ئیمپراتۆر تێبینیی ئەوەی کرد ململانێی نێوان مەسیحییە یەکتاپەرستەکان و بەخوادانەرانی

مەسیح هەڕەشە لە ئاشتیی کۆمەڵایەتیی شارەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی دەکات، بۆیە ئیمپراتۆر بانگی تەواوی قەشە گەورەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی کرد بۆ کۆبوونەوە لە شارێك لە نزیك شاری ئیستانبوڵی تورکیا، ئەم شارە پێیدەوترا (نیقییە - Nicaea)، ئێستا پێی دەوترێت (ئیزنیك - Iznik). ئامانجی ئەم کۆبوونەوەیە تاوتوێکردنی بابەتی خوایەتیی مەسیح بوو، بۆیە گەورە قەشەکان لە تەواوی جیهانی مەسیحی کۆبوونەوە لە یەکەمین کۆنگرەی ئایینی مەسیحی لە مێژوودا کە ناسراوە بە ئەنجومەنی مەسکونی یەکەم (ئەنجومەنی نیقییە - Council of Nicaea).

- دانیشتنەکانی ئەم کۆبوونەوەیە لە بیستی مانگی مایۆ دەستی پێ کرد و تاوەکوو بیست و پێنجی مانگی یۆلیۆی ساڵی ٣٢٥ز بەردەوام بوو، ئیمپراتۆر سوور بوو لەسەر ئەوەی خۆی ئامادەی دانیشتنەکان بێت و بەشداری بکات.

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: ببورە، پرۆفیسۆر، بەڵام ئیمپراتۆرێکی بتپەرست چ پەیوەندی هەیە بە دانیشتنێك کە باسی بابەتە ناوخۆییەکانی مەسیحیەتی تێدا دەکرێت؟! پیاوێکی بتپەرست! چی وایلێدەکات ئامادەی دانیشتنێکی ئایینی بێت جگە لە ئایینەکەی خۆی؟ بەڕاست ئەو چی لە گفتوگۆ بیروباوەڕییەکانی تایبەت بە سروشتی مەسیح تێدەگەیشت؟!

- نیزال بەزەردەخەنەوە گوتی: عبدالعزیز، ئەو وێنانەت لەبیرە کە پرۆفیسۆر لە سەرەتای قسەکانمان پیشانی دایت؟

- بەڵێ، لەبیرمە، وێنەکانی کەنیسە کە وێنەی ئاریۆسی بەشێوەیەکی بێڕێزانە کێشاوە لەژێر پێی قەشە مەسیحییەکان. نیزال مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بەدوای هەندێك وێنەدا گەڕا لە تۆڕی ئینتەرنێت و، بە عبدالعزیزی گوت:

- ئەو پاشایەی کە تاجەکەی لەسەرە و لە هەموو وێنەکاندا هەیە ئەوە ئیمپراتۆر قوستەنتینی یەکەمە لە ئەنجومەنی نیقییە بەوپێیەی کەنیسە وێنای دەکات، سەرەڕای ئەم وێنانەش، نیزال ئەم قسەیەی کرد و شاشەی مۆبایلەکەی لەبەردەم عبدالعزیزدا دانا.






- عبدالعزیز گوتی: بەڵام ئەوە چۆن دەبێت؟ قوستەنتین پاشایەکی بتپەرست بووە، ئەم وێنانەش وا پیشانی دەدەن، کە مەسیحییەکی باوەڕدار بووە و خاچی هەڵگرتوە!

- ئەمە ئەو فێڵەیە کە کەنیسە پێی هەستاوە، پرۆفیسۆر هاواری کرد و کێشای بە مێزەکەی بەردەمی دا.

- دووبارە عبدالعزیز پرسیاری کرد: بەڵام بۆچی کەنیسە دەیەوێت ئەوە بشارێتەوە کە ئیمپراتۆر قوستەنتین لە کاتی گرێدانی ئەنجومەنی نیقییە بتپەرست بووە؟

- پرۆفیسۆر وەلامی دایەوە: لەبەر ئەوەی ئەم ئیمپراتۆرە بتپەرستە دووبارە دینی مەسیحی ڕێك خستەوە، بەشێوەی ئێستای کە لەسەر بنەمای خوایەتیی مەسیح بنیاد نراوە، ئەگەر خەڵکە سادە مەسیحییەکە ئەم ڕاستییە مێژووییەیان بزانیبایە کە کەنیسە هەوڵی شاردنەوەیان دەدات، پیاوانی کەنیسە ئەو دەسەلاتەیان بەسەر ئەو هەژارانەدا نەدەما کە ڕووبەڕووی گەورەترین فێڵ بوونەتەوە لە مێژووی مرۆڤایەتی، بۆیە لە وێنەکانیان قوستەنتینیان وەکوو کەسێکی باوەڕداری مەسیحی وێنە کێشاوە!

- نیزال ئاماژەی بە وێنەی سەر شاشەی مۆبایلەکەی کرد و گوتی: عبدالعزیز سەیری ئەم وێنەیە بکە!



- عبدالعزیز پرسیاری کرد: ئەم وێنەیە چییە؟ ئەو نووسینە چییە کە ئەو کەسانە هەڵیان گرتووە؟!

- ئەم لەوحەیە کەنیسە ئەو بیروباوەڕەی تێدا نووسیوە، مەسیحییەتی ئێستای لەسەر دامەزراوە کە دانی پێدەنێت بە خوایەتیی مەسیحدا، ئەم بیروباوەڕە دەرەنجامی کۆبوونەوەی ئەم ئەنجومەنە بوو، ئەم بیروباوەڕە ناسراوە بە (بیروباوەڕی نیقییە - Nicene Creed)، کە بۆ یەکەمین جار تێیدا نووسرا مەسیحی کوڕی مەریەم خودایەکی پەرستراوە، ئەو خاچە گەورەیەت بینیوە بەدەستی قوستەنتین؟ بهێنە خەیاڵی خۆت کە تەواوی مەسیحییەکان بزانن ئەو ئیمپراتۆرەی کە بیروباوەڕەکەی بۆ داناون لەو کاتەدا مەسیحی نەبووە؟ ئێستا دەزانی بۆچی وێنەیان کێشاوە بەو خاچە گەورەیەی دەستیەوە؟!

- عبدالعزیز گوتی: ئای، خوایە! خەریکە سۆزم دەجوڵێت بۆ خەڵکە مەسیحییە سادەکە! بەڕاستی فێڵێکی گەورەیان لێکراوە!

- پرۆفیسۆر گوتی: ئێستا تێگەیشتی بۆچی ڤاتیکان قەدەغەی کاسۆلیکەکانی کردووە ڕۆمانەکەی دان براون (کۆدەکەی داڤینشی) بخوێننەوە؟ ئەوان نایانەوێت ئەو ڕاستییە دەربکەوێت.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام لەم کۆنگرەیەدا چی ڕوویدا؟ چۆن بڕیار لەسەر بیروباوەڕی نیقییە درا کە بانگەشە بۆ خوایەتیی مەسیح دەکات؟

پرۆفیسۆر فڕێکی لە چاکەی بەردەمی دا و دووبارە دەستی کردەوە بە قسەکردن:

- دانیشـــــتنەکانی ئەم کۆنگرەیە گفتوگۆی توندی بەخۆوە بینی لەنێوان دەستەی یەکتاپەرستان بە سەرکردایەتیی هەردوو گەورە قەشـــە ئاریۆس و یۆســـابیۆس و، ئەو دەســـتەیەی داوای زیادکردنی بنەمای خوایەتیی مەســـیحیان بۆ ئایینی مەســـیحییەت دەکرد، ئەم دەستەیە بە سەرکردایەتیی گەنجێکی تەمەن سی و سێ ساڵ بوو لە خێزانێکی بتپەرســـت بەناوی ئەســـناســـیوس ( Athanasius of Alexandria). ئەســـناســـیوس لەســـەرەتای تەمەنیدا کەســـێکی بتپەرست بوو، پێش ئەوەی ئەلیکسەندرۆسی یەکەم بیکاتە یەکێك لە قوتابییەکانی، بەپێچەوانەی ئاریۆس و یۆســـــابیۆس کە لە دایك و باوکێکی مەســـیحی بوون و، لەســـەر دەســـتی لوســـیانی ئەنتاکی فێر بوون کە تا ئەمڕۆکەش مەســـیحییەکان پێی دەڵێن قەشـــە لوســـیانی شەهید. دوای چەندین ڕۆژ لە گفتوگۆی گەرم کە تیایدا ئاریۆس و یەکتاپەرســـتەکانی تر توانییان ســـەربکەون بەســـەر ئەســـناســـیوس و هاوڕێکانیدا، کاتی دەنگدان هات لەســـــەر یەکەمین بەڵگەنامە لە مێژووی مەسیحییەتدا لەسەر خوابوونی مەسیح، زۆربەی قەشـەکان لەگەڵ ئەم دەنگـدانە نەبوون، بەڵام دەنگـدانەکە ئـازادانە نەبوو!

- عبدالعزیز پرســـیی: مەبەســـتت چییە پرۆفیســـۆر؟ دەنگدانەکە ئازادانە نەبوو؟

- وەکوو پێشـــتر بۆم باســـکردی، قوســـتەنتین بەپێی ئەوەی ئایینەکەی بتپەرستی بوو دژی بیرۆکەی یەکتاپەرستی بوو، ئایینی بتپەرســـتیی ڕۆمانەکان لە بنچینەوە پێچەوانەی یەکتاپەرســـتی بوو،

بۆیە قوستەنتین دژی دەستەی یەکتاپەرستان وەستا بە سەرکردایەتیی ئاریۆس، بڕیاری دا ئەنجامی دەنگدانەکە لە قازانجی ئەو کەسانە بێت کە بانگەشەی خوایەتیی مەسیح دەکەن. بەپێی پەرتووکی (کەنیسە، لەتبوون و خراپەکاری)ی مێژوونوس (ئەخیم ماسکیو) (Church Schism & Corruption)، ئیمپراتۆر قوستەنتین بەیانێکی پێشوەختی دەرکرد و هەڕەشەی لە هەرکەسێك کرد پێچەوانەی بیروباوەڕی خوایەتیی مەسیح دەنگبدات.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە قەشە یەکتاپەرستەکان ملیان کەچ کرد بۆ ئەم هەڕەشەیە؟

قەشە یەکتاپەرستەکان ئەم هەڕەشەیان بەجددی وەرگرت و ئاگاداریی ئەو کۆمەڵکوژییە ترسناکانە بوون کە دەسەڵاتدارە ڕۆمەکان بەرانبەر باوەڕدارە مەسیحییەکان کردبوویان بەدرێژایی مێژوو، بۆیە زۆرینە بڕیاریان دا بەزۆر دەنگبدەن لە قازانجی بیروباوەڕی نیقییە.

- عبدالعزیز گوتی: بەڵام ئەوە ترس و خۆبەدەستەوەدانە! باوەڕداری ڕاستەقینە سەرەڕای هەر هەڕەشەیەك دەبێت سووربێت لەسەر بیروباوەڕەکەی!

- نیزال گوتی: لەوانەیە ئەوەی تۆ دەیڵێیت ڕاست بێت هاوڕێ، بەڵام قسە جیاوازە لە جێبەجێکردنی کردەیی. ئەو قەشانە دەیانزانی کە لەو کاتەدا جگە لەوان قەشەی یەکتاپەرستیی تر نەماون دوای ئەوەی قوستەنتین فێڵی لێکردن بە بیرۆکەی ئامادەبوون لەو کۆنگرەیە، ئەوان باوەڕیان وابوو ئەگەر هەموویان بکوژرێن ئەوە هیچ

گەورە قەشـەیەکی یەکتاپەرسـت لە جیهاندا نامێنێت، بەم شـێوەیەش بانگەوازی یەکتاپەرسـتی لەناو دەچێت کە بۆماوەی سـێ سـەدە لەپێناویدا جەنگاون. بەهەرحاڵ لەوانەیە لەو کاتەدا بەم شـێوەیە بیریان کردبێتەوە، دەبێت ئەوەشمان لەبیر بێت، کە لە هەموو ئایینێك کەسانی لاواز هەن کە بیروڕایان دەگۆڕن، لەوانەشـە کەسـانێك لەناویاندا هەبن کە بەڕاستی باوەڕیان بە خوایەتیی مەسیح هەبێت، بەتەواوی نازانین چییان لەدڵدا بووە ئەو کاتەی دەنگیان داوە لە بەرژەوەندیی خوایەتیی مەسـیح، بەڵام ڕووداوە مێژووییەکانی دواتر کە کتێبەکانی مێژوو بۆیان تۆمارکردووین بۆمان دەردەخەن کە ئەو یەکتاپەرسـتانەی لە بەرژەوەندیی بیروباوەڕی نیقییە دەنگیان داوە لەترسـیی ئازاردانی ئیمپراتۆر قوسـتەنتین بەم کارە هەسـتاون، لەوانەیە هەر ئەمەش پاڵی بە ئیمپراتۆرەوە نابێت واز لە کاروبارە سیاسییەکانی ئیمپراتۆریەتەکەی بهێنێت و خۆی ئامادەی کۆنگرەکە بێت. وا دەردەکەوێت کە زۆربەی یەکتاپەرسـتەکان پلانی خۆڕزگارکردنیان دانابێت لەو تەڵەیەی بۆیان دانرابوو، دواتر بگەڕێنەوە بۆ شـارەکانیان و درێژە بە بانگەوازی یەکتاپەرستی بدەن کە پێیان وابوو پەڕەیەکی واژۆکراو بەزۆری لەژێر دەسەڵاتی پاشایەکی بتپەرستی زۆرداردا هیچ کاریگەرییەکی نابێت.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە ئاریۆسیش وەکوو ئەوانی تر واژۆی لەسـەر بیروباوەڕی نیقییە کرد کە بانگەشـەی خوایەتیی مەسـیح دەکات؟

- پرۆفیسۆر گوتی: سەرەڕای هەموو هەڕەشەکان، ئەم قەشە ئەمازیغییە ڕەتی کردەوە واژۆ لەســەر ئەم بەڵگەنامەیە بکات، بەپێی پەرتــووکــی (The search for the Christian doctrine of God: The Arian controversy ٣١٨-٣٨١) قەشــەی کاســۆلیکی ئیرلەندی (ڕیچارد پاتریك کروســلان هانسـن - R.P.C Hanson)، ســێ قەشــە ڕەتیان کردەوە واژۆ لەســــەر ئەم ڕێککەوتنە بکەن، ئەوانیش بریتیی بوون لە هەریەکە لە: ئــاریۆس و لەگەڵیشـــیــدا (تیونوس) قەشــــەی (مەرمەریکــا) (Theonus of Marmarica) و (ســـکاندوس) قەشـــەی (پتولیمایس) (Secundus of Ptolemais).

- عبدالعزیز دووبارە پرسیاری کرد: ئەی هاوڕێکەی ئاریۆسی یەکتاپەرست یۆسابیۆسی نیقۆمێدی؟

- وا دیارە یۆسابیۆس یەکێك بوو لەوانەی بەزۆر واژۆیان لەسەر ئەو بەڵگەنامەیە کرد، ئەمەش لەمیانەی کارەکانی دواتری ئەم قەشە یەکتاپەرستە دەردەکەوێت کە دواتر پێی هەستا و، یۆسابیۆس دڵنیامان دەکاتەوە لە ڕاســـتیی لێکدانەوەکانی نیزالی هاوڕێت دەربارەی ئەو کەسانەی کە واژوویان لەسەر بیروباوەڕی نیقییە کرد.

- عبدالعزیز پرسیی: مەبەستت چییە پرۆفیسۆر؟

- دوای کۆنگرەکە، کۆمەڵە ڕووداوێکی زۆر ڕوویاندا کە ئێستا کات نییە بۆ باسکردنیان، تێیاندا یۆسابیۆسی نیقۆمێدی بووە یەکێك لە هاوڕێ نزیکەکانی ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە، بەپێی بیروڕای

مێژوونووســـــی ئەڵمـانی (مـاتیـاس هۆفمـان - Matthias Hofmann) لە پەرتووکەکەیـدا بەنـاوی ( Vergiss das Leben nicht! Ein blick auf den got Abrahams) دەڵێت: دواتر یۆسابیۆسی نیقۆمێدی نامەیەکی بۆ ئیمپراتۆر قوســـــتەنتین نـارد کە تێیـدا دەڵێـت: (گەورەم، هەڵەیەکی گەورەمان کرد، کە ترســـــمان لە تۆ پاڵی ناین بۆ ڕازیبوون لەســـــەر بێباوەڕی !).

- عـبدالعزیز پرسیی: ئەی قەشە یەکتاپەرستەکانی تر؟ توانییان خۆیان ڕزگار بکەن دوای دەنگدانیان لەسەر بیروباوەڕی نیقییە؟

- عـبدالعزیز، هەموو ئەوەی لە نیقییە ڕوویدا تەنیا ســـەرەتایەك بوو بۆ جەنگێکی گەورە کە دوای نیقییە هەڵگیرســـــا، لەو کاتەوە جەنگی ڕاستەقینە لەنێوان یەکتاپەرستان و دووژمنەکانیان دەستی پێ کرد، بەڵام وابزانم واباشـــتره تەواوکەری چیرۆکەکە لە پەرتووکخانەکە باس بکەین.

## دوای نیقییە

پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی لەسەر کورسییە تایبەتییەکەی لە کتێبخانە دانیشت و پاشان سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە قسەکردن:

- پرۆفیسۆر گوتی: دوای تەواوبونی دانیشتنەکانی کۆنگرە، بەخوادانەرانی مەسیح پاڵپشتییەکی گەورەیان دەست کەوت دوای وەستانی دەسەڵاتی ڕۆمانیی بتپەرست لەپشتیان لەدژی مەسیحییە یەکتاپەرستەکان، بەمەش ئەو پیاوانەی کەنیسە کە باوەڕیان بە خوایەتیی مەسیح هەبوو، وەکوو پیاوانی ئایینی دەسەڵات سەیر دەکران، ئەمەش وەکوو ڕێککەوتنێکی نەنووسراو وا بوو لەنێوان ئەوان و ئیمپراتۆردا، بەوەی ئیمپراتۆر دەسەڵاتی ئایینییان پێبدات و پشتگیرییان بکات، لە بەرانبەردا ئەو قەشانە ببنە گوێ لەمستیان و خەڵکە مەسیحییەکە لە تەواوی خاکی ئیمپراتۆریەت دەستەمۆ و ژێردەستی ئیمپراتۆر بکەن، لەڕێی باوەڕپێهێنانی مەسیحییەکان بەوەی ملکەچی و جێبەجێکردنی فرمانەکانی ئیمپراتۆر پێویستە و نابێت دەستوەردان لە کاروبارە سیاسییەکانی دەوڵەت بکەن.

- نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و گوتی: (ئەوەی هیی پاشایە بیدە بە پاشا و ئەوەی هیی خوایە بیدە بە خوا)، پرۆفیسۆر لەناو ئێمەی مسوڵمانیش کەسانێك هەن باوەڕیان بەم بنەمایەی کەنیسە هەیە.

- عبدالعزیز گوتی: ئەو پیاوانەی کەنیسە چییان بەسەر مەسیحییە یەکتاپەرستەکان هێنا؟

- پرۆفیسۆر وەڵامی دایەوە: ئەو پیاوانەی کەنیسە کە باوەڕیان بە خوایەتیی مەسیح هەبوو لەوە دڵنیا بوون کە قەشە یەکتاپەرستەکان بەزۆر واژۆیان لەسەر بیروباوەڕی نیقییە کردووە، بۆیە ڕاستەوخۆ دوای کۆتاییهاتنی کۆنگرەی نیقییە هەموویان لە کەنیسەکانیان لادان و دووریان خستنەوە بۆ گوند و دوورگە دوورەدەستەکان، لەجیاتیی ئەوە قەشەکانی لایەنگری خۆیان دانا و، زۆرێك لە کەنیسە یەکتاپەرستەکانیان وێران کرد، باوەڕی خوایەتیی مەسیحیان بەسەر تێکڕای مەسیحییەکان سەپاند، لەو ساتەوە کەنیسە نازناوی (ئاریسییەکان - Arians)ی بە مەسیحییە یەکتاپەرستەکان دا، ئەمەش بۆ شاردنەوەی ڕاستییەك لە خەڵکە مەسیحییە سادەکە، ئەویش ئەوەیە، ئەو کەسانەی کە کەنیسە نازناوی ئاریسی پێداون ئەوانە لە ڕاستیدا هەڵگری پەیامی ڕاستیی یەکتاپەرستیی مەسیحن بەبێ لادان. دوای کۆتاییهاتنی کۆنگرەی نیقییە، کەنیسە قوستەنتینی هان دا بۆ سوتاندنی تەواوی پەرتووکەکانی ئاریۆس و یۆسابیۆسی نیقۆمێدی و یەکتاپەرستەکانی تر.

- نیزال ئاماژەی بە وێنەیەکی ناو مۆبایلەکەی کرد و گوتی: سەیر بکە عبدالعزیز، ئەمە کۆپییەکە لە وێنەیەك کە لە پەرتووکی قانونی کەنیسە بۆساڵی ٨٢٥ز هاتووە، تیایدا ئیمپراتۆری بێزەنتی قوستەنتین پیشان دەدات کە پەرتووکەکانی ئاریۆس دەسوتێنێت،

ئەگەر بەجوانی سەیری کەسەکەی خوارەوەی وێنەکە بکەی، دەبینی بە زمانی ئیغریقی لەسەری نووسراوە ئاریۆس، کەنیسە پەرتووکەکانی ئەم قەشەیەی سوتاندووە و مێژووەکەی شێواندووە و شتی ناڕاستی دەربارەی بیروباوەڕی خستووەتە پاڵی!

- نیزال بەزەردەخەنەوە گوتی: عبدالعزیز ئایە دەزانی (بابا نوئێل) لەنێو ئەو پیاوانەی کەنیسە بوو کە دژایەتی مەسیحییە یەکتاپەرستەکانی دەکرد؟

- عبدالعزیز بەسەرسوڕمانەوە پرسیی: چی دەڵێی؟ ئایە بابا نوئێل کەسایەتییەکی ڕاستەقینەیە؟

- بابا نوئێل، واتاکەی بە فەڕەنسی واتە باوکی بۆنەکان (جەژنەکان)، ئەو نازناوەیە کە دراوە بە نیکۆلاس قەشەی (میرا) کە ئێستا دەکەوێتە باشووری تورکیا، دوای ئەوە کەنیسە نازناوی (قدیس)یان پێدا، بەمەش ناوەکەی بووە (سەینت نیکۆلاس - Saint Nicolas)، پاشان کورتکراوە بۆ (سانتا کلوز)، ئەم قەشەیە گەورەی ئەو قەشانە بوو کە بانگەشەی خوایەتیی مەسیحییان دەکرد و لە کۆنگرەی نیقییەشدا بەشدار بوو.



- عبدالعزیز پرسیی: ئایە ئەم قەشەیە کەسێکی دەم بەپێکەنین و نەرمونیان بوو وەکوو دەردەکەوێت لەو وێنانەی بۆ ئەو دروســـت دەکرێن؟

- بەدڵنیاییەوە نەخێر، بەڵکوو بەتەواوی پێچەوانەی ئەو وێنانە بوو کە کەنیسـە بڵاویان دەکاتەوە، لەمیانەی دانیشـتنەکانی کۆنگرەی نیقییە ئەم قەشـــەیە هەســـتا بە لێدانی قەشـــە ئاریۆس لە کاتی پیشـــاندانی بەڵگەکانی یەکتاییی خودا لەلایەن ئاریۆســـەوە، ئەمەش بووە هۆی دەرکردنی لە کۆنگرە و زیندانیکردنی بەهۆی پێشێلکردنی یاســـاوە، پاشـــان دوای کۆتاییهاتنی کۆنگرە ئازاد کرا و هەســـتا بە چەوســـــاندنەوەی یەکتاپەرســـــتان لەو ناوچەیەی خۆی گەورەی قەشـەکانی بوو، لەم ساڵانەی دواییدا کەنیسـە بڕیاری دا وێنەیەکی ســـاختە بۆ نیکۆلاس دروســـت بکات، بۆ ئەمەش هەســـتا بە دزینی

کەسایەتییەکی ئەفسانەیی کە لە کەلەپووری ئیسکەندەنافی هەیە بۆ خودایەکی بتپەرست کە خۆی دەنوێنێت لە پیاوێکی ڕیشسپی بەناوی (ئۆدین - Odin)، کە بەپێی ئەفسانەکە بە عەرەبانەکەی دەفڕێت لە زستاندا بۆ ئەوەی دیاری ببەخشێتەوە لە ڕۆژی بیست و پێنجی مانگی دوازدە. کەنیسە هەموو شتێکی ئەو کەسایەتییەی دزی سەرەتا لە عەرەبانە فڕیوەکەی پاشان خەڵاتەکانی و مێژووەکەی و تەنانەت ڕیشە سپییەکەی و نووساندی بە کەسایەتیی قەشە نیکۆلاسەوە، کە لە ڕاستیدا بە پێچەوانەی ئەو وێنەیە بوو کە خۆشەویستی منداڵانە.

- عبدالعزیز گوتی: ئەمە واتە یەکتاپەرستیی مەسیحییەت دوای کۆنگرەی نیقییە کۆتایی هات!

- نیزال گوتی: بەتەواوی نا هاوڕێ.

- بەڵام چۆن؟ ئایە ئەوەی دوای نیقییە ڕوویدا کۆتایی ئاریۆس و یەکتاپەرستەکانی لەگەڵی بوون نەبوو؟

- کۆنگرەی نیقییە تەنیا سەرەتای ململانێیەکی ڕاستەقینە بوو لەنێوان یەکتاپەرستەکان کە بە ئاریسییەکان دەناسران و بەخوادانەرانی مەسیح کە بە نیقییەکان دەناسران، دوای ئەوەی نیقییەکان وایان گومان برد کە کارەکە بۆ ئەوان یەکلایی بووەتەوە و سەرکەوتوون بەسەر یەکتاپەرستەکاندا، تەنیا ئافرەتێك توانیی هاوسەنگیی هێز لە بەرژەوەندیی ئاریسییەکان بگۆڕێت، بەم هۆیەوە ئاریسییەکان بەهێزتر بوون لە پێشتر!

- عبدالعزیز پرسیی: ئەم ئافرەتە کێ بوو؟

- نیزال گوتی: دایکی ئیمپراتۆر قوســتەنتینی گەورە، خاتوو (هێلانە - Helana)ی یەکتاپەرست بوو، کە ئەمڕۆ مەسیحییەکان پێی دەڵێن (Saint Helana).

- زۆر گوێم لە ناوی ئەم ئافرەتە بووە، زۆرێك لە قوتابخانە و چارەخانە و کۆمەڵە مەســیحییەکان ناوی (ســەینت هێلانە)یان هەڵگرتوە، بەڵام چۆن مەســیحییەکانی ئێســتا بە گەورەی دەزانن و ڕێزی دەگرن لەگەڵ ئەوەی تۆ دەڵێی یەکتاپەرســت بووە؟ عبدالعزیز پرسیاری کرد.

پرۆفیسۆر بریستلی هاتە ناو بابەتەکە و گوتی:

- ئەمەش یەکێکە لە فێڵەکانی کەنیســە، کەنیســە لە خەڵکە مەســیحییەکەی دەشــارێتەوە کە ئەو خاتوونە کە کەنیســەی قیامەی دروســت کردووە لە بنەڕەتدا یەکتاپەرســت بووە و، کارتێکراو بووە بە وتەکانی قەشەی یەکتاپەرست لوسیانی ئەنتاکی مامۆستای ئاریۆس، قەشــەکـانیش ئەمە دەزانن و نکوڵی لێنـاکەن، بەپێی چەنـدین ســەرچاوەیەکی مێژوویی کە مێژوونوســانی گەورەی ڕۆژئـاوا نووسـیویانە لە وێنەی: (هاگیس سیڤان - Hagith Sivan) و (گۆردۆن مێڵتۆن -J.Gordon melton ) و (کینیس گی هولۆم - Kenneth G Hulom)، بەپێی ئەم ســەرچاوانە و سەرچاوەی تریش ئەم ئافرەتە یەکتاپەرستە دەسەڵاتەکەی بەکار هێناوە

بۆ گێڕانەوەی زۆربەی قەشە ئاریسییەکان بۆ کەنیسەکانیان و نزیککردنەوەیان لە کوڕە ئیمپراتۆرەکەی، یەکێك لەو قەشانەش کە لە ئیمپراتۆری نزیك خستنەوە قەشە یۆسابیۆسی نیقۆمێدی هاوڕێی ئاریۆس بوو لە ساڵی ٣٢٨ز، واتە دوای سێ ساڵ لە کۆنگرەی نیقییە، بەمەش یۆسابیۆسی نیقۆمێدی سەرکردایەتیی یەکتاپەرستە ئاریسیەکانی گرتە دەست دوای دوورخستنەوەی ئاریۆسی هاوڕێی.

- عبدالعزیز پرسیی: ئەم قەشە ئاریسییە دوای ئەوە چیی کرد؟

- یۆسابیۆسی نیقۆمێدی توانیی زیاتر لە ئیمپراتۆر نزیك ببێتەوە و باوەڕی پێ بهێنێت بە بیروباوەڕی ڕاستیی مەسیح، بەمەش قوستەنتین ئاستی ئەو کارەساتەی بۆ دەرکەوت کە ئەنجامی دابوو بە ناچارکردنی گەورە قەشەکان بە واژۆکردن لەسەر کۆنگرەی نیقییە، بۆیە ویستی هەڵەکەی ڕاستبکاتەوە و کارەکان بگەڕێنێتەوە سەر باری پێشوی، بەڵام لەو کاتەدا هاوسەنگیی هێز بەتەواوی گۆڕابوو، ئەو قەشانەی باوەڕیان بە خوایەتیی مەسیح بوو دەستیان بەسەر تەواوی کەنیسەکانی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیدا گرتبوو، بۆیە هەر هەڕەشەیەك بۆ دەسەڵاتە ئایینیەکەیان هەڕەشە بوو لەسەر دەسەڵاتی سیاسیی ئیمپراتۆر، بەڵام قوستەنتین سوور بوو لەسەر لەناوبردنی ئەو دێوەزمەیەی خۆی هۆکاری دروستبوونی بوو، بۆیە بە یارمەتیی ڕاوێژکار و دەستەڕاستی یۆسابیۆسی نیقۆمێدی هەستا بە دەرهێنانی بەرە لەژێر پێی قەشەکانی نیقییە.

- عبدالعزیز پرسیی: ئەوە چۆن ڕوویدا؟
ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە هەستا بە لادانی ئوسقوفی شاری (ئەنتاکییە) سێیەم گەورە شاری ئیمپراتۆریەت، پاشان ئوسقوفی (ئەنقەرە)، پاشان لەساڵی ٣٣٥ز هەستا بە لادانی سەرکردەی نیقییەکان و دوژمنی یەکەمی ئاریسییەکان (ئەسناسیۆس)، کە دوای کۆنگرەی نیقییە بووبووە ئوسقوفی شاری ئیسکەندەرییە.
- دووبارە عبدالعزیز پرسیی: پڕۆفیسۆر (ئەسناسیۆس) چۆن دوورخرایەوە؟
- ئەسناسیوس لادرا و دوورخرایەوە بۆ شاری (تریر)ی ئەڵمانی دوای ئەوەی لە کۆنگرەی (سووری یەکەم) تۆمەتبار کرا، لەم کۆنگرەیەدا قەشەکان باسی ئەو تۆمەتە ئەخلاقی و داراییانەیان کرد کە ئاڕاستەی ئەسناسیوس کرابوون، سەرەڕای تۆمەتبارکردنی بە کوشتنی قەشەیەك و هێشتنەوەی دەستەکەی و بەکارهێنانی لە کاری سیحردا.
- ئەی ئاریۆس؟ چی بەسەرهات؟
- وا دیارە قوستەنتین نەیویست لەسەرەتادا ئاریۆس بگەڕێنێتەوە لەترسیی شۆڕشی نیقییەکان لەدژی، بۆیە بانگکردنی دوا خست تا دوای لادانی ئەسناسیۆس، دوای ئەوە ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە بانگهێشتی (ئاریۆس)ی کرد بۆ (قوستەنتینیە)ی پایتەخت و لە ساڵی ٣٣٦ز، ئاریۆس گەیشتە شاری قوستەنتینییە، تێکڕای مەسیحییەکان پێشوازییەکی گەورەیان لێکرد و، ئیمپراتۆر لە کۆشکە

تـايبەتييەكەی خۆی میوانداری كرد، دوای دانیشـــتنێكی كورت، ئیمپراتۆر ڕاســـتەوخۆ داوای لە ئوســـقوفی قوســـتەنتینییە (ئەلـــیـــكســـانـــدەری یەكەم - Alexander of Constantinople) كرد ئـاریۆس بەفەرمی بگەڕێنێتەوە بۆ هاوبەشـێتیی كەنیســـە، بەڵام ئەم كارە پێویســـتی بە ڕێوڕەسـمێكی كەنیســەییی تایبەت بوو، تیایدا ئەلیكســاندەری یەكەم هەڵدەســتا بە پێدانی خواردن و خواردنەوە بە ئاریۆس.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە ئەلیكساندەر كەسێكی یەكتاپەرست، یان نیقی بوو؟

- نیزال وەڵامی دایەوە: بەپێچەوانەوە، ئەلیكســـاندەر دوژمنی یەكتاپەرســـتان بوو، بەڵكوو یەكێك لە پێشـــڕەوانی نیقییە بوو كە بانگەشــەی خوایەتیی مەســیحییان دەكرد، خۆشــی وەكوو نوێنەری شـاری (بێزەنتیۆم - Byzantium) بەشداری كۆنگرەی نیقییەی كرد، كە دواتر شاری (قوستەنتینیەی) لە شوێن دروست كرا.

- عبدالعزیز گوتی: هەمیشــە لە خۆمم دەپرســی بۆچی ئەم ئیمپراتۆریەتە ڕۆمانییە ناونراوە ئیمپراتۆریەتیی بێزەنتی، ئێســـتا لەو نهێنییە تێگەیشتم.

- ڕاســـتە، ئەم ئیمپراتۆریەتە ڕۆمـانییە نوێیە كە ئیمپراتۆر قوســتەنتینی گەورە دروستی كرد ناونرا بە ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیی بێزەنتی، دوای ئەوەی قوسـتەنتین پایتەختی لە (ڕۆما)وە گواستەوە

بۆ ئەم شـــارە، دووبارە بنیادی ناوە و گەورەی کرد و، بەناوی خۆی ناوی نا (قوستەنتینییە).

- عبدالعزیز پرسیاری کرد: دوای ئەوە چی ڕوویدا؟

- نیزال وەڵامی دایەوە: لە هەمان ڕۆژدا کە ئاریۆس گەیشـتە قوسـتەنتینییە و لەو کاتەی لە شـەقامەکانی قوسـتەنتینییە دەگەڕا تاوەکوو سـڵاو لە مەسـیحییەکان بکات کە ئەو بووبووە پاڵەوانێکی تێکۆشـەر، هەستی بە ئازارێکی لەناکاو کرد لە ڕیخۆڵەکانی، پاشان تووشـی سـکچونێکی بەهێز بوو، دواتر تووشـی خوێنبەربوونێکی زۆر بوو کە بووە هۆی بێهۆشبوونی.

- عبدالعزیز پرسـیی: بەڵام چۆن تووشـی ئەم خوێنبەربوونە لەناکاوەی ڕیخۆڵەکانی بوو؟

- پیاوانی کەنیسـەی نیقی بەمە زۆر خۆشـحاڵ بوون و پێیان وابوو ئەوەی لەم ڕۆژەدا ڕوویدا سزایەکی خوایی بوو بۆسـەر ئاریۆس و، لەبەر ئەوە بەشـێوەیەکی هەرزەکارانە جنێویان پێدەدا کە شـیاو نەبوو بۆ کەسانێك کە پێیان وابوو نوێنەری خودان لەسەر زەوی.

هەرکەسێك کەمترین زانیاریی پزیشکی هەبێت دەزانێت ئەوەی ئاریۆس لەو ڕۆژەدا تووشـی بوو بریتی بوو لە نیشـانەکانی ژەهراویبوونی کۆئەندامی هەرس، چەندین مێژوونووسی ڕۆژئاوایی ئەمەیان دووپات کردووەتەوە، وەکوو (ئێدوارد جیبۆن) و (چارلز فیرمن) و (جۆناسـان کیرش).

ئەو مێژوونووسـانە بێگومانن لەوەی کە ئاریۆس ژەهرخوارد کراوە لەلایەن دوژمنەکانیەوە، ئەم کارەش لەوانەیە لەلایەن ئوسقوفی قوستەنتینییە ئەلیکساندەری یەکەمەوە ئەنجام درابێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی ترسا لەوەی قوستەنتینی ئیمپراتۆر وەکوو قەشە نیقییەکانی تر لابدات و، ئاریۆس لە شـوێنی دابنێت، بۆ ئەوەی ببێتە ئوسقوفی قوستەنتینییەی پایتەختی دەوڵەتی ڕۆمانی، بۆ زانیاریشت کەنیسە نازناوی (قدیس)ی بەخشی بە ئەلیکساندەر دوایی مردنی.

- عبدالعزیز پرسیی: مەسیحییە یەکتاپەرستەکان چییان بەسەر هات دوای مردنی ئاریۆسی سەرکردەیان؟

پرۆفیسۆر لەسەر کورسییەکەی هەستا و کەمێك بێدەنگ بوو، ڕووی کردە نەخشەکەی جیهان کە لە بەردەمی هەڵواسرابوو، پاشان سەیری عبدالعزیزی کرد و گوتی:

- گوێ بگرە عبدالعزیز، وا دیارە ئەو کەسانەی ئاریۆسیان تیرۆرکردووە لە دوو شت بێ ئاگا بوون، یەکەم: ئەو کەسەی پێی وابێت دەکرێت بەسەر بیروباوەڕێکدا سەربکەوێت بە لەناوبردنی بانگخوازەکەی ئەوە هەڵە تێگەیشتووە، دووەم: ئەو کەسەی ئاریۆسی ژەهر خوارد کرد لەیادی چوو جورعەیەکی تری ژەهر بکرێت بۆ لەناوبردنی کەسێکی تر کە دواتر بووە بەڵای گیانیان!

- عبدالعزیز بەمەراقەوە پرسیی: پرۆفیسۆر، ئەو کەسە کێ بوو؟

- ئەو کەسە یۆسابیۆسی نیقۆمیدی بوو!

- عبدالعزيز گوتی: یۆسابیۆس لەو کاتەدا چی کرد؟

- دوای کوشتنی ئاریۆسی هاوڕێی، یۆسابیۆسی نیقۆمیدی بووە سەرکردەی یەکتاپەرستانی جیهان، کاری کرد بۆ بڵاوکردنەوەی بانگەوازی ڕاستەقینەی مەسیح لەنێو تێکڕای خەڵکی، تەنیا ساڵێك دوای کوشتنی مەسیح واتە ساڵی ٣٣٧ز، ئەو تۆوە گەشەی کرد کە ئاریۆس چاندبووی پێش مردنی و یۆسابیۆس بە هەوڵ و ماندووبوونی ئاوی دابوو، سەرکەوتنی گەورە بەدیهات، قوستەنتینی گەورە شوێنکەوتنی خۆی بۆ مەسیحییەتی ڕاستەقینە ڕاگەیاند کە ئەو کاتە بە (ئاریۆسی) دەناسرا، بەمەش ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیی بیزەنتیی قوستەنتینی یەکەم ناسراو بە قوستەنتینی گەورە، بووە یەکەمین ئیمپراتۆری ڕۆمانیی یەکتاپەرست لە مێژوودا، دوای ئەوەی شوێن ئایینی مەسیحیەتی ڕاستەقینە کەوت لەسەر دەستی یۆسابیۆسی نیقۆمیدی.

- عبدالعزیز گوتی: بەرنامەیەکی بەڵگەنامەییم بینی باسی لەوە دەکرد کە قوستەنتین لە کۆتاییی تەمەنی بووە مەسیحی، بەڵام تۆ دەڵێیت بووە ئاریۆسییەکی یەکتاپەرست!

- ئەمەش یەکێکە لە فێڵەکانی پیاوانی کەنیسە، ئەوان بە مەسیحییەکان دەڵێن کە ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە بووە مەسیحی، بەڵام تەواوی ڕاستییەکە باسناکەن، ئەوان باسی ئەوە ناکەن کە قوستەنتین بووە ئاریۆسییەکی یەکتاپەرست نەك ئەو ئایینە تازەیەی

پیاوانی نیقییه دایان هێنا، واته قوستەنتین باوەڕی بە خوایەتیی مەسیح نەبوو.

- عبدالعزیز دووبارە پرسیی: بەڵام پرۆفیسۆر ئەوە لە مێژوودا سەلماوە؟

- ئەو ڕاستییە مێژووییە، تەنانەت پیاوانی کەنیسەش دانی پێدا دەنێن، نەك هەر ئەوە بەڵکوو نیمچە کۆدەنگییەك هەیە لەسەر ئەوەی ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە بووەتە مەسیحی لەسەردەستی یۆسابیۆسی نیقۆمیدی، تەواوی کەنیسە هاوچەرخەکان یەکدەنگن لەسەرئەوەی سەرکردەی مەسیحییە یەکتاپەرستەکان بووە، بۆچی ئیمپراتۆر داوای کرد کە (تعمید) بکرێت لەلایەن یۆسابیۆسی نیقۆمیدی؟ ئەمە پرسیارێکە دەبێت مەسیحییەکان لە پیاوانی کەنیسەی بپرسن!

مێژوونووس (مارك ئێلینگستۆن - Mark Ellingston) لە مەوسوعە مێژووییە گەورەکەی (گەڕانەوە بۆ ڕیشەکانمان - Reclaiming our roots) دەڵێت: قوستەنتین و جێگرەوەکانی ژیانی قەشە نیقییەکان و بانگەوازە سیانییەکەیان تاڵ کرد.

- بەتەواوی چ کاتێك قوستەنتینی گەورە شوێنکەوتنی خۆی بۆ ئاریۆسی یەکتاپەرست ڕاگەیاند؟

- لە کۆتا ڕۆژەکانی و پێش کۆچی دوایی لە ٢٢ی مانگی مایۆی سالی ٣٣٧ز، ئەم ئیمپراتۆرە ڕۆمانییە یەکتاپەرستە لە شاری نیقۆمیدیا لەلای هاوڕێ و وەزیرەکەی یۆسابیۆسی نیقۆمیدی کە

ئوسقوفی ئەو شارە بوو کۆچی دوایی کرد، بەڵام من پێم وایە ماوەیەکی زۆر پێش ئەوە باوەڕی هێناوە، ئەمەش هەڵسوکەوتی کۆتا ساڵەکانی ژیانیمان بۆ لێکدەداتەوە، ئەو کەسەی سەیری ژیانی کۆتا ساڵەکانی ئیمپراتۆر بکات، دەبینێت ئیمپراتۆر هاوسۆزییەکی زۆری بۆ ئاریۆسەکان هەبووە کە لە سەرەتادا ئەو هۆکاری ئازار و مەینەتییەکانیان بوو، لەوانەیە ساڵانێك پێش مردنی قوستەنتین باوەڕی بە ئایینی یەکتاپەرستی مەسیحییەت هێنا بێت، بەڵام ئەوەی ئاشکرا نەکردووە بۆ ئەوەی بزوتنەوە چاکسازییەکەی بگەیەنێتە ئەنجام، بە ڕاستکردنەوەی کارەکانی کۆنگرەی نیقییە، لەوانەیە ئاشکراکردنی باوەڕهێنانەکەی کارەکانی دواخستبا و ئوسقوفە نیقییەکان خەڵکیان لەدژ هاندابا، بەتایبەت کە دەسەڵاتیان زیادی کردبوو دوای کۆنگرەی نیقییە، بەڵام قوستەنتین بە هاوکاریی یۆسابیۆسی هاوڕێی توانیی هێواش هێواش بەرە لەژێر پێیان دەربهێنێت.

- عبدالعزیز پرسیی: ئاریۆسەکان چییان بەسەر هات دوای کۆچی دوایی ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە؟

- نیزال گوتی: ڕووداوێك بووە هۆی گۆڕینی پارسەنگیی هێز لەو کاتەدا، ئاریۆسەکان بەهێز بوون دوای دانیشتنی ئیمپراتۆرێکی گەورەی ئاریۆسی لەسەر کورسیی ئیمپراتۆرییەت، ئەم ئیمپراتۆرە لەپێناو یەکتایی مەسیحییەت تێکۆشا و یەکتاپەرستی بۆ یەکەمجار کردە ئایینی فەرمیی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی، هەر لەسەردەمی ئەم

ئیمپراتۆره ئەنجامەکانی کۆنگرەی نیقییه هەڵوەشایەوە کە داندەنێن بە خوایەتیی مەسیح!

- عبدالعزیز پرسـیاری کرد: بەڵام ئەم ئیمپراتۆرە کێ بوو کە ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی گۆڕی بۆ ئیمپراتۆریەتێکی یەکتاپەرست؟

# دوای قوستەنتینی گەورە

تۆماس برسـتلی هەندێك كتێبی لەسـەر كتێبخانەكە دانا، پاشـان دووبارە لەسەر كورسییەكەی دانیشتەوە و دەستی كردەوە بە قسەكردن:
دوای كۆچی دوایی قوسـتەنتینی گەورە لە سـالّی ٣٣٧ز، ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیی بیزەنتی دابەش بوو بۆ چوار بەش، سـێیان كوڕی قوستەنتین بوون ئەوی تریان كوڕی خوشكی قوستەنتین بوو:

بەشـی ڕۆژاوا: لە ئینگلتەرا درێژ دەبووەوە تاوەكوو مەغریب لەژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆر (قوستەنتینی دووەم - Constantine II) كوڕی قوستەنتینی گەورە بوو.

بەشـی ناوەڕاسـت: لە ناوەڕاسـتی ئەورووپا و ئیتالیا درێژ دەبوویەوە تاوەكوو باكووری ئەفریقا و لە لیبیاوە تاوەكوو ڕۆژهەڵاتی مەغریب، لەژێر دەسـتی ئیمپراتۆر (قوسـتانسـی یەكەم Constans I-) كـوڕی قـوسـتەنـتـینـی گەورەدا بـوو.
بەشـی ڕۆژهەڵات: درێژدەبوویەوە لە توركیای ئێسـتا و وڵاتی شـام تاوەكوو میسـر و لیبیا و قوسـتەنتینییەی پایتەختی لەخۆ دەگرت، لەژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆری ڕۆمانیی (قوسـتەنتیۆسـی دووەم - Constantius II) كـوڕی قـوسـتەنـتـینـی گەورەدابـوو.
یۆنـان و بەلقـان: لەژێر دەسـەڵاتی ئیمپراتۆر (دالمـاتیۆس - Dalmatius) كوڕی خوشكی قوستەنتینی گەورەدابوو.

-        عبدالعزیز پرسیی: پرۆفیسۆر ئایە کوڕانی قوستەنتینی گەورە لەسەر ئایینی یەکتاپەرستی بوون وەکوو باوکیان؟

-        وا دیارە تەنیا کوڕی قوستەنتین کە ئاریۆسی بوو وەکوو باوکی ئیمپراتۆر قوستەنتیۆسی دووەم بوو، بەڵام دوو کوڕەکەی تر مەیلیان بەلای بیرۆکەی نیقییەکاندا بوو، بۆیە ویستیان ئەسناسیوس بگێڕنەوە، دوای ئەوەی باوکیان دووری خستبووەوە پاش ئیدانەکردنی لە کۆنگرەی (صور)، بەڵام هەڕەشەکانی قوستەنتیۆسی دووەم لە دوو براکەی ڕێگری لێکردن لەم کارە، دوای دەستبەسەرداگرتنی جەنەڕاڵ (مەگنینتیۆز - Magnentius) بەسەر زۆربەی خاکی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی و کوشتنی هەریەکە لە قوستەنتینی دووەم و قوستانسی یەکەم، ئیمپراتۆری ئاریۆسی قوستەنتیۆسی دووەم کۆتا منداڵی قوستەنتینی گەورە بوو کە لەژیاندا مابێت، بۆیە تەواوی خاکی ئیمپراتۆریەتەکەی یەك خست و خستیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە لە ساڵی (٣٥٠ز).



- عبدالعزیز پرسـیی: ئەم ئیمپراتۆرە ئاریۆسـییە چیی کرد دوای یەکخستنی ئیمپراتۆریەتەکەی؟

- دوای یەکخسـتنی خاکی ئیمپراتۆریەتەکەی قوسـتەنتیۆس بڕیاری دا بە دامەزراندنی سـەرکردەی یەکتاپەرستان، یۆسابیۆسی نیقۆمیدی وەکوو ئوسقوفی گشتیی قوستەنتینیەی پایتەخت، پاشان ئەم ئیمپراتۆرە یەکتاپەرستە کۆمەڵێك کۆنگرەی گشتی بۆ زانایانی مەسـیحی بەست، تیایدا قەشـە مەسـیحییەکان ڕێك کەوتن لەسـەر هەڵوەشـاندنەوەی تێکڕای بڕیارەکانی کۆنگرەی نیقییەی تایبەت بە خوایەتیی مەسـیح، لە بەناوبانگترینی ئەو کۆنگرانەش کۆنگرەی میلانۆ بوو لەسـاڵی ٣٥٥ز، چونکە لەو کاتەدا شـاری میلانۆی ئیتالی یەکێك بوو لە گرنگترین مەڵبەندەکانی یەکتاپەرسـتی لە ئەورووپا، دوای ئەم کۆنگرانەش مەسـیحیی یەکتاپەرسـتی یاخود ئاریۆسـی بووە ئایینی فەرمیی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیی بیزەنتی کە درێژدەبوویەوە لە ئینگلتەرا و ئیسـپانیا و مەغریب تاوەکوو عێراق و تورکیا و میسر و باکووری ئەفریقا و ئەورووپای ناوەڕاست، لەو کاتەدا هەوڵەکانی هاوسەری یەکتاپەرستیی ئیمپراتۆر (یوسیبیا) دەرکەوتن، هەسـتا بە خزمەتێکی گەورە بۆ بڵاوکردنەوەی یەکتاپەرسـتی، لە کاتێکدا هاوڕێکەی ئاریۆس قەشـە یۆسابیۆسی نیقۆمیدی هەوڵی فێرکردنی واتای یەکتاپەرسـتی دەدا بە خەڵکی، زۆر کەس لەسـەر دەستی ئەم قەشە فێر بوون کە دواتر بوونە بڵاوکەرەوەی یەکتاپەرستی

له هەموو جیهان، بەهۆی هەوڵەکانی ئەو ئیمپراتۆره یەکتاپەرستە ئاریۆسی گەیشتە حەبەشە و نیمچە دوورگەی عەرەبی.

- عبدالعزیز گوتی: گوتت نیمچە دوورگەی عەرەبی؟

- بەڵێ، عبدالعزیز، یەکێك لە و قەشـانەی قوستەنتیۆس ڕەوانەی کردن کەسێك بوو بەناوی (سیۆفیلۆسی هیندی - Theophilos the Indian ) و لە ساڵی ٣٦٤ز کۆچی دوایی کردووە، ئەم قەشەیە بە ڕەچەڵەك دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە دوورگەکانی زەریای هیندی، هەندێك کەس پێیان وایە دوورگەی سۆقەترەی یەمەنییە، هەندێکیش دەڵێن یەکێك لە دوورگەکانی مالدیف بووە، کاتێك بچووك بوو لەلایەن ڕۆمەکانەوە بە دیل گیراوە تاوەکوو بیکەنە کۆیلە، شوێنی ئایینی مەسیحیی ئاریۆسی کەوت دوای ئەوەی ئەم ئایینە لە تەواوی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی بڵاوبویەوە، دواتر ئیمپراتۆری ڕۆمانیی یەکتاپەرست قوستەنتیۆسی دووەم بە گەشتێکی بانگخوازی ناردی بۆ کیشوەری ئاسیا بۆ بڵاوکردنەوەی ئایینی یەکتاپەرستیی مەسیحی، لە میانەی گەشتەکەیدا ئەم قەشەیە بە وڵاتی حەبەشەدا تێپەڕی و یەکتاپەرستی تێدا بڵاوکردەوە، پاشان گەیشتە یەمەن و ئایینەکەی تێدا بڵاو کردەوە، ئەمەش هۆکاری ئەوەیە لە کۆندا زۆربەی خەڵکی حەبەشە و یەمەن شوێن ئایینی مەسیحی یەکتاپەرستی کەوتوون، هەموو ئەو کارانە بە هەوڵی ئیمپراتۆری ئاریۆسی مەسیحیی قوستەنتیۆسی دووەم بوو، کە لە ساڵی ٣٦١ز کۆچی دوایی کرد.

- عبدالعزیز پرسیی: دوای کۆچی دواییی چی ڕوویدا پرۆفیسۆر؟

- ئیمپراتۆر قوستەنتیۆسی دووەم هیچ کوڕێکی نەبوو، بۆیە دوای خۆی دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی کەوتە دەست ئامۆزاکەی (جولیان)، کە ناسراوە بە (جولیانی هەڵگەڕاوە - Julian The Apostate)، لەبەر ئەوەی بووە بتپەرست و دژایەتیی مەسیحییەتی کرد، دوژمنی یەکەمی مەسیحییەکان جولیانی هەڵگەڕاوە هەستا بە گێڕانەوەی ئەسناسیوس و ئایینەکەی و کردیەوە بە قەشەی ئیسکەندەرییە لەجیاتیی قەشە یەکتاپەرستەکەی کە جولیان دووری خستەوە لە پۆستەکەی!

- عبدالعزیز پرسیی: وەکوو من لە قسەکانت تێگەیشتبم پرۆفیسۆر، جولیانی هەڵگەڕاوە دوژمنی مەسیحییەکان بوو، کەواتە بۆچی سوور بوو لەسەر ڕێزلێنانی گەورەی قەشە نیقییەکان ئەسناسیۆس؟ هەروەها بۆچی دەسەڵاتی ئایینی ئیسکەندەرییەی پێ دا؟!

- پرسیارێکی جوانە عبدالعزیز، بەڵام پێویستە لە پاپای ڤاتیکان بکرێت نەك لە من، ئەوەی جێگای سەرسوڕمانە ئەوەیە جولیان لە هەمان کاتدا خراپترین جۆری سزا و کوشتنی دەرحەق بە مەسیحییە یەکتاپەرستەکان پەیڕەو دەکرد، یەکێك لەوانەی سزای دەدا قەشەی ئاریۆسی یەکتاپەرست (ماریسی خەلقادۆنی - Maris Of Chaleedon) بوو، کە ئەم قەشەیە هاوڕێی ئاریۆس بوو لە

قــوتــابــخـــانەکەی لـــوســـیـــانـــی شـــەهـــید.
بەپێی وتەی هەردوو مێژوونووس هنری واس (Henry wace)
و دەیڤید دوبارخر (David Rohrbacher) ماریس چاوەکانی
لەدەســـت دابوو، بۆیەش جولیان گاڵتەی پێدەکرد، کاتێك ئەم قەشـــە
مەسیحییە یەکتاپەرستە لە بەرانبەر جولیانی هەڵگەڕاوە وەستا و پێی
گوت:

سوپاس بۆ خودا کە بێبەشی کردووم لە بینین تاوەکوو ڕووت نەبینم.

- دووبارە عبدالعزیز پرسیی: ئایە ئاریۆسی کۆتایی هات دوای گەیشتنی ئەم ئیمپراتۆرە بەدەسەڵات؟

- دوای دەســـــەڵاتی جولیانی هەڵگەڕاوە، چەندین ئیمپراتۆر دەســەڵاتیان وەرگرت، هەندێکیان یەکتاپەرســت بوون وەکوو: ئیمپراتۆر ڤەیـلـنـس (Valens) و ئـیـمـپـراتـۆر ڤـالـێـنـتـیـنـای دووەم (Valentinian II) جەستینا (Empress Justina)، کە پاڵپشــتیی ئاریۆســەکانی کرد لە پایتەختی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیی ڕۆژاوا میلانۆ بە هاوکاریی ئوسـقوفی ئاریۆســی یەکتاپەرســت لەو شـارە، تاوەکوو دەسـەڵات کەوتە دەسـت ئیمپراتۆرێك کە دەسـەڵاتەکەی خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی ئێستای مەسیحییەتدا.

- پرۆفیسۆر، ئەو ئیمپراتۆرە کێ بوو؟

- ئەو کەســـە ئیمپراتۆر (ســـیۆدۆســـیوســـی یەکەم - Theodosius I) بوو، ئەم ئیمپراتۆرە جگە لەوەی بـاوەڕی بە خوایەتیی مەســیح هەبوو، تاوانبارێکی جەنگیش بوو بەتەواوی مانا،

ئەم ئیمپراتۆرە جگە لە هاوکاریکردنی ئەو قەشـــانەی باوەڕیان بە خوایەتیی مەسیح هەبوو هەستا بە کۆمەڵکوژییەکی ترسناك بەرانبەر بە مەســـیحییە یەکتاپەرســـتەکان، کە ئەوکاتە زۆرینەی خەڵکە مەســـیحییەکە بوون، مێژوونووســـی ڕۆمانیی بەناوبانگ (جیرۆم - Jerome) کە یەکەم کەسە پەرتووکی پیرۆزی وەرگێڕا بۆ زمانی لاتینی، دەربارەی زۆری ژمارەی ئاریســـییەکان لەو کاتەدا دەڵێت: (معظم العـــالم صــــرخ وتعجـــب ليجـــد نفســـــه اريســـيـــا).

هەروەها شـــاری قوســـتەنتینییەی پایتەختی ئیمپراتۆریەتیی بێزەنتی شـــارێکی بەتەواوی یەکتاپەرســـت بوو، مێژوونووس (مۆرس وایلز - Maurice Wiles) لە پەرتووکەکەی بەناوی (Archetypal Heresy Ariauism Through the Centuries)دا دەڵێت: نەك تەنیا سەرکردایەتیی کەنیسە لە قوستەنتینییە ئاریۆسی بوو بۆ ماوەی ٤٠ ساڵ، بەڵکوو زۆربەی خەڵکە مەسیحییەکەی ئەو شارە مەیلیان بەلای یەکتاپەرستی بوو نەك بیروباوەڕی نیقییە.

لە ماوەی فەرمانڕەواییدا ئیمپراتۆر ســـیۆدۆســـیوســـی یەکەم و هاوکارەکانی لە کەنیسەی نیقی هەستان بە هەڵوەشاندنەوەی تەواوی بڕیارەکانی کۆنگرە مەســـیحییەکان کە بیروباوەڕی یەکتاپەرســـتی دەچەسپاند.

نیزال دووبارە مۆبایلەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و ئاماژەی بە وێنەی سەر شاشەی ئامێرەکەی کرد و گوتی:

- سەیری ئێرە بکە عبدالعزیز، ئەوە وێنەی تەواوی کۆنگرە مەسکونییەکانە کە کەنیسە ئەنجامی داوە، تێیدا ماوەی نێوان کۆنگرەی یەکەم لە نیقییە لە ساڵی ٣٢٥ز و کۆنگرەی دووەم لە قوستەنتینییە لە ساڵی ٣٨١ز (٦٠) ساڵە، لەگەڵ ئەوەی لەو ساڵانەدا چەندین کۆنگرە بەستراون، بەڵام کەنیسە هەموو ئەوانە دەشارێتەوە، بۆ ئەوەی مەسیحییەکان بەدوای ئەوەدا نەگەڕێن کە لەم کۆنگرە مەسکونیانەدا باسکراوە، کە دەری دەخات مەسیح تەنیا مرۆڤێکە و خودا نییە.

- عبدالعزیز پرسیی: دوای ئەوە چی ڕوویدا پرۆفیسۆر؟

- ئیمپراتۆر سیۆدۆسیوسی یەکەم فەرمانی کرد بە بەستنی کۆنگرە لە شاری قوستەنتینییە لە ساڵی ٣٨١ز، کە ناسراوە بە کۆنگرەی قوستەنتینییەی یەکەم، لەم کۆنگرەیەدا خودایەکی تر بۆ نیقییەکان زیاد کرا، بۆ یەکەم جار لەم کۆنگرەیەدا گیانی پیرۆز (روح القدس) وەکوو خودا ئەژمارکرا و، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا سێ پایە گرنگەکەی مەسیحییەتی سەردەم تەواو بوو.

- ببورە، پرۆفیسۆر، بەباشی شارەزای ئایینی مەسیحییەت نیم، ئەو بنەما گرنگەی مەسیحییەتی سەردەم کامەیە کە چوار سەدە دوای لەدایکبوونی مەسیح سەری هەڵدا؟

- ئەو بنەمایە بنەمای سیانەی پیرۆزە ((Trinity))!

# ترینیتی



پرۆ فیســـــۆر هەندێك لە وێنەكانی لە پەرتووكخانەكەی دەرهێنا و پیشانی عبدالعزیزی دەدا، پاشان گوتی:

- كورتەی بنەمـــای ســـــیانەی پیرۆز بەپێی بیروبـــاوەڕی مەســـیحییە سیانییەكان بریتین لە: باوك كە وەكوو پیرەپیاوێك وێنەی دەكێشرێت، هەروەها كوڕ كە مەبەستیان مەسیحە، زۆربەی كات وەكوو پیاوێكی قژزەرد وێنەی دەكێشن، هەروەها گیانی پیرۆز (روح القدس) كە وەكوو كۆترێك وێنەی دەكێشـــن، هەریەك لەو ســـیانە یەكســـانە بە خودا، بەڵام هیچ كامیان یەكسان نین بە یەكتر.



- باشە، من وەکوو نیزالی هاوڕێم شارەزای بیرکاری نیم، بەڵام بەو زانیارییە سەرەتاییە کەمەم لە بیرکاری و بنەماکانی لۆژیك دەبێت هەموو ئەو شتانەی یەکسانن بە نەگۆڕێك لەگەڵ یەکتریش یەکسان دەبن؟

- پڕۆفیسۆر گوتی: کێشە لە خودی بنەماکەدا نییە، چونکە لە هەر ئاینێکدا کۆمەڵێك شت هەن کە تێگەیشتنیان سەختە، بەڵام کێشەکە ئەوەیە ئەم بنەمایە بۆ یەکەمجار ٣٨٠ ساڵ دوای لەدایکبوونی مەسیح دەرکەوت!

- ئایە لە ئینجیلدا هیچ دەقێك نییە ئاماژەی بەم بنەمایە دابێت؟

- نیزال گوتی: باسی کام ئینجیل دەکەی عبدالعزیز؟

- ئینجیل، پەرتووکی پیرۆزی مەسیحییەکان!

- ببورە، پڕۆفیسۆر، زۆرێك لە مسوڵمانەکان وەکوو هاوڕێکەم زۆر شت دەربارەی مەسیحییەت نازانن، پێیانوایە پەرتووکی ئێستای مەسیحییەکان ناوی ئینجیلە، دەتوانی کورتەیەکمان دەربارەی پەرتووکی پیرۆز (كتاب المقدس) بۆ باسبکەی؟

- باشە، عبدالعزیز، نازانم مەبەستت لە ئینجیل چییە، بەڵام ئەگەر مەبەستت لە ئینجیل ئەو پەرتووکە پیرۆزەیە کە بۆ حەزرەتی عیسا دابەزی، ئەو پەرتووکە بە شێوە تەواوەکەی لە ئێستادا ونە، تەنانەت مەسیحییەکانیش بانگەشەی ئەوە ناکەن ئەو پەرتووکەی ئێستا لەبەردەستیانە هەمان پەرتووکی سەردەمی مەسیح بێت، ئەو

پەرتووکەی ئێستای مەسیحییەکان پێی دەوترێت پەرتووکی پیرۆز یاخود (بایبڵ - Bible)، بایبڵ وشەیەکی ئیغریقییە بە واتای (پەرتووك) دێت، بۆیە پەرتووکخانە لە زۆربەی زمانە جیهانییەکان پێی دەوترێت بیبیۆتیك یاخود بیبلیۆتیکا، ئەو پەرتووکەش چەندین کەس لە سەردەمی جیاواز نووسیویانە، هەندێك لەو کەسانە ناسراون، هەندێکیشیان مێژوویان نادیارە، پەرتووکی پیرۆز هەندێك شتی لەوە تێدایە کە بۆ مەسیح دابەزی، بەڵام چیرۆکی زۆریشی تێدایە کە دوای مەسیح نووسراون، هەروەها چەندین شتی بۆ زیاد کراوە بەدرێژایی مێژوو، ئەم پەرتووکە بەبەردەوامی گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بۆیە چەندین کۆپیی جیاوازی هەیە کە زۆر لە یەکتری جیاوازن، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو گۆڕانکاری و زیادکردنانەی پەرتووکی پیرۆز بەدرێژایی مێژوو، تەنیا دەقێکی تێدا نییە ئاماژە بە بنەمای سیانەی پیرۆز بکات، سەرەڕای ئەوەی ئەم بنەمایە گرنگترین بنەمای مەسیحییەتی سەردەمە!

- عبدالعزیز گوتی: پرۆفیسۆر، لەبیرمە یەکێك لە هاوڕێکانم کە سەر بە یەکێك لە کەنیسەکان بوو دەیویست منیش بچمە سەر بیروباوەڕەکەی، کاتێك پێم گوت کە ئێمە پێمان وایە مەسیح پەیامبەرێکە و خودا نییە، بەڵام ئەو دەقێکی لە پەرتووکەکەی بۆ خوێندمەوە کە دەیگوت مەسیح و خودا یەکسانن.

- ئەمەش یەکێکە لە فێڵە گەورەکانی پیاوانی کەنیسە و لە ماوەی ئەم سەدانەی دواییدا هەڵیان بەستووە، دوای ئەوەی پرسیارەکان

زۆر بوون دەربارەی سروشتی مەسیح، بەڵام تەنیا بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نییە لە پەرتووكی پیرۆز، ئەو دەقەی باست كرد تەنیا دەقێكە لە پەرتووكی پیرۆزی ئێستا كە دەكرێت بە بیروباوەڕی سیانەیی شرۆڤە بكرێت، ئەو دەقەش لە نامەی یوحەنای یەكەم ئیسحاحی پێنجەم ٧:٥ دا هاتووە، دەقەكەش ئەمەیە (فان الذين يشهدون فى السماءو هم ثلاثة: الأب، والكلمة، والروح القدس، وهؤلاء الثلاثة هم واحد).

سەرەڕای ئەوەی ئەم ڕستەیە ئەوەی لێ وەرناگیرێت كە پێویستە ئەو سیانە بپەرسترێن، هەر لە بنەڕەتدا ئەو ڕستەیە بوونی نییە، ئەو ڕاستییەی زۆربەی مەسیحییەكان نایزانن ئەوەیە كە ئەم ڕستەیە بەشێك نەبووە لە پەرتووكی پیرۆز، بەڵكوو بەم دواییانە زیادكراوە لە شوێنی (الروح، والماء، والدم).

هەندێك لە چاپەكانی پەرتووكی پیرۆز ئەمەیان لە پەراوێزدا ڕوون كردووەتەوە، بەڵام زۆربەی چاپەكان بەئەنقەست لایان بردووە، هەندێكیان تەنیا ئەستێرەیەك یان دوو كەوانەیان داناوە بەبێ ئەوەی لە پەراوێز ئاماژەیەكی پێبكەن، بەڵام هەندێك چاپی ئینگلیزی پەرتووكی پیرۆز وەكوو: (چاپی نوێی جیهانی - New international version) ئەم ڕستەیان بەتەواوی لابردووە و لە پەراوێزدا نووسیویانە: Not found in any Greek manuscript before the sixteenth century).

واتای ئەم ڕستەیە (لە هیچ یەكێك لە چاپە یۆنانییەكان بوونی نەبووە پێش سەدەی شازدە!).

پێنج سەد ساڵ پێش ئێستا ئەم ڕستەیە لە پەرتووکی پیرۆزدا بوونی نەبووە، کە ئێستا وەکوو بەڵگەی ڕاستیی بیروباوەڕی سیانەیی باسی دەکەن لە پەرتووکی پیرۆزدا!

**"فَإِنَّ الَّذِينَ يَشْهَدُونَ فِي السَّمَاءِ هُمْ ثَلاَثَةٌ: الآبُ، وَالْكَلِمَةُ، وَالرُّوحُ الْقُدُسُ. وَهؤُلاَءِ الثَّلاَثَةُ هُمْ وَاحِدٌ."**

**(1 يو 5: 7)**

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە داوا لە مەسیحییەکان دەکرێت باوەڕ بەم بنەمایە بهێنن؟

- زۆربەی کەنیسە گەورەکان سیانەی پیرۆز بە گرنگترین بنچینەی بیروباوەڕی ئیمانی مەسیحی دادەنێن، بۆیە باوەڕ بە سیانەی پیرۆز بووەتە مەرجی ئیمان لای نیقییەکان، کە دواتر بە سیانییەکان ناسران دوای کۆنگرەی قوستەنتینییەی یەکەم، واتە ٣٨٠ ساڵ دوای لەدایکبوونی مەسیح. سەیربکە عبدالعزیز، هەموو ناکۆکییەکانی پێش ئەم ڕێکەوتە دەربارەی خوایەتیی مەسیح بوو نەك باوەڕ بە سیانەی پیرۆز، چونکە پێش ئەم ڕێکەوتە (روح القدس) هەرگیز وەکوو خودا باس نەکراوە، تەنانەت لە کۆنگرەی نیقییەش.

لەبەر ئەوە ئەو ڕاستییەی کەنیسە لە خەڵکە مەسیحییە سادەکەی دەشارێتەوە ئەوەیە بیروباوەڕی سیانەی پیرۆز، کە ئێستا زۆربەی

مەسـیحییەکان باوەڕیان پێیەتی دوای ٣٨٠ سـاڵ لە لەدایکبوونی مەسیح سەریهەڵداوە!

- عبدالعزیز دووبارە پرسیاری کرد: ئاریۆسـەکان دوای ئەم ڕێکەوتە چییان بەسـەرهات، پاش ئەوەی ئیمپراتۆر بیروباوەڕی سیانەیی بەسەر هەموو مەسیحییەکاند سەپاند؟

- لەو ماوەیەدا ئاریۆسەکان تووشی قەسابخانەی ترسناك و سزای وەحشیگەرانە بوونەوە، بۆ ناچارکردنیان بە زەبری شمشێر تاوەکوو باوەڕ بە بیروباوەڕی سیانەی پیرۆز بهێنن.

- واتە لەسەردەستی ئەم ئیمپراتۆرە ئاریۆسەکان بەتەواوی لەناو بران؟

- نیزال وەڵامی دایەوە: بەپێچەوانەوە دوای ئەم داپڵۆسـینە توانایان چەند هێندە زیادی کرد!

- بەڵام چۆن؟! چۆن ژمارەیان زیادی کرد، لە کاتێکدا ڕووبەڕووی لەناوبردنی بەکۆمەڵ دەبوونەوە؟!

- کاتێك بەم شێوە ترسناکە ئاریۆسەکان پاڵەپەستۆیان دەخرایە سەر، ئاریۆسەکان نەخشەیەکی تازەیان بۆ ئەورووپا و باکووری ئەفریقا داڕشت، کە تاوەکوو ئەمڕۆش شوێنەوارەکانی دیارن!

- چی ڕوویدا؟

- نیزال گوتی: دوای ئەو ئازار و مەینەتییانەی یەکتاپەرستان لەسەردەستی هێزی ڕۆمانی سیانەپەرست تووشی بوون، زۆرێك لە هۆزە ئەورووپییە ئاریۆسەکان بەتایبەت هۆزە جەرمانییەکان بەرگرییان

هەڵبژارد، بۆیە ئەم هۆزە یەکتاپەرستانە خۆیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانیی بێزەنتی ئامادە کرد و لەماوەی دوو سەدەدا و لە کۆتایی سەدەی چوارەمی زایینی تاوەکوو کۆتایی سەدەی شەشەم، جەنگی وێرانکەر لەنێوان ڕۆمان و هۆزە ئەورووپییە یەکتاپەرستەکان ڕوویدا، کە ئایین گەورەترین پاڵنەری ئەم جەنگانە بوون، واتە جەنگ بوو لەنێوان یەکتاپەرستان و سیانەپەرستان، لەو ماوەیەدا ئاریۆسەکان توانییان زەوییەکی فراوان لەژێردەستی ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی دەربهێنن و دەوڵەتی ئاریۆسی سەربەخۆی تێدا دابمەزرێنن، ئەو دەوڵەتە یەکەمین دەوڵەت بوو لە مێژووی ئەورووپادا، کە لە ئیمپراتۆریەتیی ڕۆمانی جیابوونەوە، هۆزی ئاریۆسی قووتە خۆرئاواییەکان دەوڵەتی قووتە خۆرئاواییەکانیان لە ئیسپانیا و بەشێکی فەڕەنسا دامەزراند، هەروەها هۆزی سویبی یەکتاپەرست دەوڵەتی ئاریۆسی سوێبیان دروست کرد کە ئەمڕۆ بە پرتوگال ناسراوە، هەروەها قوتە خۆرهەڵاتییەکان دەوڵەتی قوتە خۆرهەڵاتییەکانیان لە ئیتالیا و زۆرێك لە وڵاتە ئەورووپییە هاوسێکانی پێك هێنا، هەروەها هەردوو هۆزی ڤاندال و ئالان دەوڵەتێکی گەورەیان لە باکووری ئەفریقا دروست کرد کە ناسراوە بە دەوڵەتی ڤاندال و خاکێکی فراوانی دەگرتە خۆ لە مەغریب و تونس و جەزائیر و لیبیا و دورگەکانی دەریای سپی، جگە لەمانەش هۆزەکانی لومپارد و بروجەندی شانشینی ئاریۆسی یەکتاپەرستیان پێك هێنا لە ناوچە جیاوازەکانی فەڕەنسا و ئیتالیا.




- عبدالعزیز بەپەرۆشییەوە پرسیی: ئەو شانشینە یەکتاپەرستە ئەورووپییە چیی بەسەرهات؟

- نیگەران مەبە هاوڕێ، لە چەند ڕۆژی داهاتوودا بەوردی بەشەکەی تری چیرۆکی ئاریۆسەکانت بۆ باس دەکەم، ئێمە ئاڵنگاری (تحدی )یەکمان لەپێشە دەربارەی مێژووی ونیان، بەڵام ئێستا شتێکی گرنگ هەیە دەمەوێ پرۆفیسۆری لێ ئاگادار بکەمەوە.

- نیزال، تۆ لە پەیوەندییەکەت پێت گوتم دەتەوێت بمبینی بۆ وەرگرتنی زانیاری دەربارەی شتێکی گرنگ، پرۆفیسۆر بەپێکەنینەوە گوتی ئەوکات پێت نەگوتم مێژووی سەدە کۆنەکانی مەسیحییەت بۆ هاوڕێکەت باسبکەم.

- سوپاسی ئەو کاتە بە نرخەت دەکەم پرۆفیسۆر کە پێت بەخشین، ئەم پێشەکییە سوودبەخشە بۆ من و هاوڕێکەم بۆ ئەو گەشتەیە لە پەیوەندییەکەم بۆم باسکردیت.

- پرۆفیسۆر گوتی: نیزال تۆ دڵنیای دەتەوێت بەردەوام بیت لە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم گرووپە ترسناکانە، من لە دڵتەنگیت بۆ دایك و خانەوادەکەت تێدەگەم، بەڵام بیرکردنەوە لە تۆڵەسەندنەوە لەم گرووپە نهێنییە ترسناکە دەتگەیەنێتە هەمان چارەنووس.

- سوپاس بۆ ئامۆژگارییەکانت پرۆفیسۆر، بابەتەکە بۆ من گەورەترە لە تۆڵەسەندنەوە لەو بکوژانە، پێم وایە بەتەواوی ئامادەی ئەم کارەم. دوای لەدەستدانی ئەندامانی خێزانەکەم هیچ شتێکم نییە لەدەستی بدەم، ئێستا پرۆفیسۆر ئەتوانم ئەو لاپەڕەیەت پێبدەم کە دایکم پێش کوشتنی بۆی جێهێشتووم.

نیزال لە جانتاکەی ئەو لاپەڕەیەی دەرهێنا کە پێکدەهات لە پیت و هێما و ژمارە کە واتاکانیان ئاشکرا نەبوو، لەسەرەوەی ئەو هێمایانە وێنەی سێوێك هەبوو هێمای (X)ی لەسەر کێشرابوو لەناو دەفرێکی قوپاو، دوای چەند ساتێك لە بێدەنگی پرۆفیسۆر گوتی:

- نیزال، پێم وایە کارەکە پەیوەستە بە نیوتنەوە!

- منیش لەگەڵ یەکەم بینینی ئەو سێوە هەمان بیروڕام بۆ دروستبوو، ئەمەش زیاتر هانی دام تاوەکوو بێمە لەندەن، بەڵام پرۆفیسۆر پەیوەندی نیوتن چییە بە ئاریۆسەکانەوە؟

- نیزال وا دیارە نازانی کە سێر ئیسحاق نیوتن یەکێك بوو لە سەرسەختترین لایەنگرانی ئاریۆسی هاوڕێت!

# نیوتنی یەکتاپەرست



- نیزال گوتی: هەرگیز پێم وا نەبوو نیوتن باوەڕی بە بوونی خودا هەبێت!
- پڕۆفیسۆر پرسیی: چی وایکردووە ئەم باوەڕەت هەبێت؟
- نیزال گوتی: ئێمەی عەرەب پێمان وایە کە زانا گەورەکانی خۆرئاوا بێباوەڕن.
- بەڵام ڕاستی پێچەوانەی ڕاکەی تۆیە، زۆرێك لە گەورە زانایانی خۆرئاوا بەدرێژاییی مێژوو باوەڕیان بە بوونی خودا هەبووە، بەڵام ئەوە بەو واتایە نایەت کە باوەڕیان بە مەسیحییەت بووبێت بەو شێوەیەی ئێستای. لەوانەیە ئەمەش هۆکاربێت بۆ ئەوەی خەڵکی پێیان وابێت ئەو زانایانە ئارەزوویان بەلای بێباوەڕیدا چووبێت، ڕاستییەکەی ئەوەیە زۆربەی زانایانی سەدەکانی پێشوو بێباوەڕ نەبوون، بەڵکوو بەپێچەوانەوە زانست هانی داون باوەڕێکی تەواویان بە خودا هەبێت.

نیوتن بەئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات و دەڵێت: ئەو سیستەمە جوانەی پێکهاتووە لە ڕۆژ و هەساره و کلکدارەکان، تەنیا دەکرێت لەلایەن کارگێڕێکی زیرەك و بەتواناوە بەڕێوەببرێت. بۆیە کەنیسە نایەوێت خەڵکی ئەو ڕاستییە بزانن کە ئەو زانایانە بێباوەڕ نەبوون بە خودا، بەڵکوو بێباوەڕ بوون بە پێناسەی کەنیسە بۆ خودا، بە واتایەکی تر بێباوەڕ بوون بە سیانەی پیرۆز، ئەمەش کەنیسەی هان دا بۆ ئەوەی بە توندترین شێواز ڕووبەڕوویان ببێتەوە لە سەرەتای شۆڕشی ڕێنسانسی ئەوروپی و لەلایەن کەنیسەوە تووشی سزادان و کوشتن و بەندکردن بوونەوە، تەنانەت هەندێك جار کار دەگەیشتە سوتاندن بەزیندوێتی بە بڕیاری ڤاتیکان. لەڕاستیدا ئەو پێشکەوتنە زانستییەی ئەوروپا بەخۆیەوە بینیی لەم سەدانەی دواییدا بووە هۆی ئەوەی قورس بێت لای عەقڵیەتی تاکی ئەوروپی بیروباوەڕی سیانەی پیرۆز قبووڵ بکات، کە پێچەوانەی هەموو یاسا زانستی و لۆژیکی و سروشتییەکانە.

- مێژوونا‌س و بیرکاریزانی بەریتانیی بەناوبانگ (جاکوب برۆناوسکی -Jacob Bronowski) لە کتێبە ناودارەکەی (بەرزبونەوەی مرۆڤ - The ascent of man) باسی ئەم ڕاستییە دەکات و دەڵێت: زانایانی سەدەی حەڤدەی زایینی هەستیان بە شەرمەزاری دەکرد لە بنەمای سیانەی پیرۆز.
- نیزال پرسیی: واتا ئەمە بووبووە دیاردەیەك لەنێوان زانایان لەم کاتەدا؟

- نەك تەنیا زانایان، بەڵكوو زۆرێك لە ناوداران و پیاوانی سیاسیی ئەو كاتە باوەڕیان بە لێكدانەوەی كەنیسە نەبوو كە لەسەر بنەمای سیانەی پیرۆز دامەزراوە، لێرەدا كاتی ئەوە نییە ئاماژە بە ناوی هەموویان بكەم، بەڵام بەسە ئەوە بزانی یەكێك لە باپیرانم كە دامەزرێنەری زانستی كیمیای سەردەم و دۆزەرەوەی ئۆكسجینە، (جۆزێف پریستلی Joseph Priestly) ، یەكێك بووە لە یەكتاپەرستانی ئینگلیز، كە باوەڕیان بە سیانەی پیرۆز و خوایەتیی مەسیح نەبووە.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام پرۆفیسۆر، یەكتاپەرستی چۆن گەیشتە ئینگلتەرا؟

- سەرەتاكەی دەگەڕێتەوە بۆ ئیسپانیا لە سەدەی شازدەی زایینی، لەو كاتەدا لە ڕۆژئاوای ئیسپانیا بزوتنەوەیەكی نوێی یەكتاپەرستی سەری هەڵدا كە بنەمای سێ خودایان ڕەت دەكردەوە، ئەم بزوتنەوە نوێیە پێیان دەوترا (یەكتایەكان - Unitarian). سەركردەی ئەم بزوتنەوەیە كەسێك بوو بەناوی (مایكڵ سێرڤیتس - Michael Servetus)، كە شارەزایی لە زیاتر لە زانستێكدا هەبوو. ئەم زانایە هەستا بە نووسینی دوو پەرتووكی گرنگ بە ناوەكانی (هەڵەكانی سێ خودایی) و (گێڕانەوەی مەسیحییەت)، لەم دوو پەرتووكەیدا سێرڤیتس ڕەخنەیەكی توندی لە بیروباوەڕی سێ خوایی گرت، لەبەرئەوە كەنیسەی كاسۆلیكی لە ئیسپانیا هەستا بە دژایەتیكردنی و لە ئەنجامدا سێرڤیتس ڕایكرد بۆ ناوچە جیاوازەكانی

ئەوروپا، تاوەکوو لە سویسرا دەستگیر کرا و، دەسەڵاتدارانی ئەوروپا پێشبڕکێیان بوو کامیان شەرەفی لە داردانی ئەو بیریارەیان دەستبکەوێت، بەڵام سەرانی کەنیسەی سویسری سوور بوون لەسەرئەوەی لەسەر خاکەکەی ئەوان دادگایی بکرێت. دادگا بڕیارێکی ترسناکی دەرکرد بەوەی پەرتووکەکانی لێ ببەسترێت و بەزیندوێتی بسوتێندرێت، بەڵام سێرڤیتس بەرانبەر دەیان کەس لە پیاوانی کەنیسە لە کاتی دادگایکردنەکەیدا بوێرانە گوتی: سیانەی پیرۆز دڕندەیەکی لەناوبەرە و مەسیحییەت ڕاو دەکات. ئەمە داهێنانێکی فەلسەفییە و هیچ بنەمایەکی لە پەرتووکی پیرۆزدا نییە!

- لە ٢٧ی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٥٥٣ز میکایل سێرڤیتس بەزیندووێتی لە شاری جنێفی سویسرا سوتێندرا.



- دوای سوتاندنی سێرڤیتس چیرۆکەکەی لە تەواوی ئەوروپا بڵاوبویەوە و، تەنیا لەماوەی ١٠٠ ساڵدا لە ئەوروپا ٥٠٠ گرووپی یەکتاپەرست پەیدا بوون، بەڵکوو کار گەیشتە ئەوەی پاشا (جۆن سیگمۆند زاپۆلیا) ( John Sigismund Zapolya King Of Hungary) پاشای شانشینی هەنگاریا، هاتە سەر ئایینی یەکتاپەرستی و بە یاوەری وەزیرە یەکتاپەرستەکەی (فیرینس داڤید - Ferenc David) لە ساڵی ١٥٦٨ز هەستا بە دەرکردنی بەیانە بەناوبانگەکەی بە ناوی (بڕیاری تۆردۆ - Edict of Tordo)، بەم بۆنەیەوە ئەم بڕیارە یەکەمین یاسایە لە مێژووی نوێی ئەوروپا کە ئازادی هەڵبژاردنی بیروباوەڕی بە مرۆڤەکان دابێت. پێش ئەوەی پیاوانی کەنیسە و دەسەڵاتدارە هاوکارەکانیان هەستن بە لادانی ئەم پاشا یەکتاپەرستە و وەزیرەکەی و دادگایکردنیان بە تۆمەتی دەرچوون لە ئایین (هرگقە)، دادگا فرمانێکی ترسناکی بەسەر ئەم وەزیرە یەکتاپەرستەدا سەپاند بە فڕێدانی لە ژێرزەمینێکی تاریکی یەکێك لە قەڵاکان بەبێ خواردن و خواردنەوە تاوەکوو بەهێواشی بمرێت.

دوای ئەوە لە لیتوانیا و پۆڵەندا گرووپێکی ئایینی گەورە دروست بوو بە ناوی (برایەتی پۆڵەندی - Bracia Polscy)، دەتوانرێت پێیان بوترێت ئاریۆسی لەبەر ڕەتکردنەوەی بیرۆکەی سیانەی پیرۆز، شاری (ڕاکەو - Rakow) مەڵبەندی ئەم گرووپە بوو، پێش ئەوەی کەنیسە پاڵەپەستۆ بخاتە سەر پەرلەمانی پۆڵەندی لە ساڵی

١٦٣٨ز بۆ دەرکردنی بڕیاری لەناوبردنی ئەو گرووپە یەکتاپەرستە، ئەمەش ڕوویدا، بەڵام لە ئینگلتەرا یەکتاپەرستی بڵاوبوویەوە لەسەردەستی پیاوێك بە ناوی (جۆن بۆدڵ - John Boddle)، ئەم بیریارە چەندین جار کرایە بەندینخانە تاوەکوو تەندروستیی خراپ بوو و، کۆچی دوایی کرد، بەڵام بیروباوەڕە یەکتاپەرستییەکەی بەشێوەیەکی گەورە بڵاوبوویەوە لە ئینگلتەرا و، زۆرێك لە ئینگلیزەکان بوونە یەکتاپەرست، یەکێك لەوانەش زانای گەورەی فیزیا (ئیسحاق نیوتن) بوو، کە کەسێکی باوەڕدار بوو و باوەڕی بە سیانەی پیرۆز نەبوو. لەوانەیە تووشی سەرسوڕمان بیت ئەگەر بزانی دۆزەرەوەی بەناوبانگی هێزی کێشکردن بەئاشکرا نووسیویەتی کە لایەنگری ئاریۆسە و دژی ئەسناسیۆسە، ئەمەش بەم دواییانە دۆزرایەوە لە بەڵگەنامەیەکی مێژوویی لە چوارچێوەی تێبینییەکانی ئیسحاق نیوتن، کە بەدەستی خۆی نووسیویەتی. ئەم بەڵگەنامانە لەم سالانەی دواییدا لێکۆڵینەوە لە ڕاستیی و دروستییەکەی کرا لەلایەن شارەزایانی زانکۆی کامبریجی بەریتانی، لە بەرنامەیەکی بەڵگەنامەییدا مێژوونوسی بەناوبانگی ئینگلیزی پرۆفیسۆر (سیمۆن شیفر) لە زانکۆی کامبریج گوتی: لەبەرئەوەی نیوتن باوەڕی وا بوو خودا هاوشێوەی نییە و خاوەن دەسەلاتێکی بێ کۆتایە، دەتوانین بڵێین نیوتن کەسێکی لادەر بوو لە ئایین (هرگقه)، بەمانایەکی تر نیوتن لە واتای خوایەتیی مەسیحی کەم کردەوە، تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی نکۆڵی خوایەتیی مەسیح بکات.

بەڵام (گاری کریتیانسـۆن) نووسەری ژیانی نیوتن دەڵێت: (نیوتن بەزوویی گەیشـتە ئەوەی بنەمای سـیانەی پیرۆز بە مانای بێ باوەڕی دێت بە وەسـیەتی یەکەم لە پەرتووکی پیرۆز، لەبەرئەوەی وەسیەتی یەکەمی خودا دەڵێت: جگە لە من خودایەکی ترت نابێت).

لەبەرئەوە بەپێی بیروباوەڕی نیوتن پەرسـتنی کوڕ و باوك و گیانی پیرۆز بریتییە لە بێ باوەڕی!

- نیزال پرسـیی: کەواتە مەسـیحییە یەکتاپەرسـتەکان لەم سەردەمەدا چییان بەسەر هات؟

- لە ئەنجامی تاوانی کەنیسە ئەوروپییەکان بەرانبەر یەکتاپەرستان، بەشێکی زۆریان لە سەدەکانی پێشوو کۆچیان کرد بۆ ئەمریکا، لەبەرئەوەی لە ئەمریکا دەرەچەیەکی کراوەی ئایینیان بینی کە دەیپاراستن لە دەستدرێژیی کەنیسە ئەوروپییە سیانەپەرستەکان. ئەو یەکتاپەرستانە لە تێکڕای ئەمریکا بڵاوبوونەوە و بەشدار بوون لە شۆڕشەکەی، تەنانەت گەیشتنە لوتکەی دەسەڵاتی ویلایەتە یەکگرتوەکان. ڕەنگە پێت سەیر بێت ئەگەر بڵێم چوار لە سەرکردەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان لەسەر مەزهەبی یەکتاپەرستیی (Unitarian) بوون و، باوەڕیان بە سیانەی پیرۆز نەبوو، ئەو سەرکردانەش بریتی بوون لە: (جۆن ئادامز -John Adams)، (جۆن کوینسی ئادامز - John Quincy Adams) و، (میلارد فیلمۆر - Millard Fillmore) و (ویلیام هواراد تافت

- William Taft)، ئەمەی کۆتـایی سـەرکردەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە پێش نزیکەی سـەدەیەك، سـەرەڕای سـەرکردەی بەنـاوبـانگی ئەمریکی (ئەبراهـام لینکۆڵن - Abraham Lincoln)، بەپێی وتەکانی هاوڕێ و پاسەوانە تایبەتیەکەی (وارد هیل لامۆن - Ward Hill Lamon)، کە نووسـەری ژیانی لینکۆڵنە، لینکۆڵن باوەڕی بە خوایەتیی مەسـیح نەبووە، تەنانەت بـاوەڕی بەوەش نەبووە کە مەسـیح کوڕی خودایە، لامۆن لە پەرتووکەکەی (ژیانی لینکۆڵن - The Life Of Lincoln) دەربارەی لینکۆڵن دەڵێت: بەدرێژاییی ئەو کاتانە هەرگیز لە زاری یاخود قەڵەمی لینکۆڵن دەرنەچووە، کە بڵێت مەسـیح خودایە یاخود ڕزگارکەری مرۆڤایەتییە.

زۆربەی ئەوانەی نزیکی لینکۆڵن بوون دەڵێن ئەو باوەڕی بە یەکتایی خودا هەبووە و باوەڕی بە سـیانەی پیرۆز نەبووە، هەروەها نزیکەکانی ئاماژە بەوە دەکەن کە لینکۆڵن پێی وابووە پەرتووکی پیرۆز دەستکاری کراوە، هەروەها ئەو هیچ کات باوەڕی بە خوایەتیی مەسـیح نەبووە، بۆیە ئەگەر لە سـەرچاوە باوەڕپێکراوەکان یاخود لە سـەرچاوە فەرمییەکانی ئینتەرنێت بەدوای ئایینی سـەرکردەکانی ئەمریکادا بگەڕێیت، بۆ نموونە، ئەگەر لە گووگڵ بنووسی: (Religious affiliations of presidents of the unites states) دەبینی هەموو سـەرکردە ئەمریکییەکان لەپاڵ ناوەکانیان نووسـراوە (مەسـیحی - Christian) بە مەزهەبە جیاوازەکانیەوە،

ئەبراهام لینکۆڵن تاکە سەرکردەیە کە لەپاڵ ناوەکەی لە خانەی ئایین نووسراوە (None specified) واتە نەزاندراوە، ئەمەش وای لە هەندێك کەس کردووە بە جولەکە یاخود ماسـۆنی لە قەڵەمی بدەن، هەندێکیش پێیان وابووە مسـولمان بووە، بەتایبەت کە هەندێك لە وتارەکانی ئایەتی قورئانی پیرۆزی لەخۆ گرتووە، هەروەها دایکی (نانسی هانکس - Nancy Hanks) ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ مسـولمانان لە ڕەگەزی (مێلوجینس - Melungeons)، ئەو ناوەش لە ئەمریکا بە هەموو ئەو کەسـانە دەوترێت کە مسـولمانی ئەندەلوس بوون و گەشـتیان کردووە بۆ ئەمریکا. ئەمە بە ڕای لێکۆڵەری ئەمریکی (برێنت کێنێدی - Brent Kennedy)، بەڵام هەموو ئەوانە نیزال تەنیا لێکدانەوە و شرۆڤەن، دەکرێت ڕاست بن یاخود هەڵە، بەڵام لە مێژوودا ئەوە چەسپاوە لینکۆڵن باوەڕی بە خودا هەبووە و، باوەڕی بە خوایەتیی مەسیح و سیانەی پیرۆز نەبووە.

- نیزال پرسیی: ئایە هیچ یەکتاپەرستێك لە ئەوروپا نەمایەوە؟

- لە ئەوروپا و لە سـەرەتای سـەدەی ڕابردوو، سـەرهەڵدانی ئازادیی ئایینی ڕێژەیی دووبارە چەندین ناوی ئەوروپی بەناوبانگ دەرکەوتن، کە بەئاشـکرا دژی بیروباوەڕی سـیانەی پیرۆز بوون و یەکتاپەرست بوون، دوای ئەوە کەنیسە یەکتاپەرستەکان لە ئەڵمانیا و دانیمارك نەرویج و سـوید و وڵاتانی تری ئەوروپا دەرکەوتن، بۆ نموونە، سیاسەتمەداری سویدی و بانگەوازکاری ئاشتیی جیهانی و خاوەنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لە سـاڵی ١٩٠٨ز، (کلاس پۆنتوس

ئارنۆڵدسـن - Klas Pontus Arnoldson) کەنیسـەیەکی یەکتاپەرستی لە سوید دامەزراند و ناوی نا (الباحثون عن الحقیقه)، بەڵام دەبێت ئـاگـادار بین کە یەکتـاپەرسـتـانی چاخی تـازە لە هەمووشـتێکدا هەمان بیروباوەڕی ئاریۆسـیان نەبووە، چونکە بە تێپەڕبوونی ڕۆژگـار لادان و چەوتی زۆر هـاتووەتە نێو زۆرێـك لە مەزهەبە یەکتاپەرسـتییەکان و، چەندین شـتی تازەیان داهێناوە کە پێشـتر بوونی نەبووە و، بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار لادانەکانیان زیادی کردووە، بەم شـێوەیە مەزهەبێکی تازەیان دروسـت کرد و ناویان نا مەزهەبە یەکتاپەرسـتییەکان، بەڵام لە ڕاسـتیدا زۆر لەو ئایینە یەکتاپەرستییە دوور بوون کە مەسیح هێنای، بۆ زانیاریتان بزوتنەوەی بشـود یهوە (Jehovah's Witnesses)ی مەسیحی کە لەم سـەردەمەدا زۆر بەربڵاون خۆیان بە بزوتنەوەیەکی یەکتاپەرست دەدەنە قەڵەم، واتە شـوێنکەوتوانی باوەڕیان بە سـیانەی پیرۆز نییە، بەڵام باوەڕیان بە بیرۆکەی تر هەیە کە مەترسی لەمە کەمتر نییە.

- پرۆفیسـۆر، تکـایە سـەیرێکی ئەم لاپەڕەیە بکە!

نیزال ئـامـاژەی بەو لاپەڕەیە کرد کە دایکی بۆی جێهێشـتبوو، لاپەڕەکەی لەبەردەم پرۆفیسۆر دانا ئەمیش لێی ڕامابوو.

# مەتەڵی سێوەکە



- بە ڕای تۆ پرۆفیسۆر بۆچی دایکم لە سەرەوەی ئەم لاپەڕەیەی پیت و ژمارەی نەناسراوی تێدایە هێمای سێوێکی کێشاوە؟
- بەتەواوی نازانم، وەکوو لە لێکۆڵینەوەکەی دایکتدا دیارە کە هەندێکیم سەیر کردووە، دایکت بە زانیاریی مەترسیدار گەیشتووە کە دەمانگەیەنێتە شوێنی گەنجینەی ڤاندالی ئەفسانەیی، بەڵام بەئاشکرا شوێنەکەی دیاری نەکردووە لەبەر هەر هۆکارێك بێت، وا دیارە ئەم لاپەڕەیە وەڵامی ئەو مەتەڵەی تێدایە کە دەمانگەیەنێتە شوێنی گەنجینەکە، بۆیە ئەو چەتانە دەیانەوێت بە هەرشێوەیەك بێت دەستیان بەم زانیارییانە بگات، بەڵام وەکوو پێت گوتم بەجێهێشتنی ئەم لاپەڕەیە هەڵیخەڵەتاندون. پێم وایە دۆزینەوەی مەتەڵەکەی دایکت شاردراوەتەوە لە لێکدانەوەی واتای ئەو ژمارە و پیتانە لەڕێگای ڕیزکردنیان بەپێی هەندێك یاسای فیزیایی نیوتن و هاوکێشە بیرکارییەکانی، بۆیە دایکت پیتی (X)ی لەسەر سێوەکە کێشاوە و،

سێوەکەی لەناو دەفرێکی قوپاو داناوە و، ئەم هێمایانەشی لە خوارەوە کێشـــاوە، وا دیـارە ســـێوەکە هێمـایە بۆ نیوتن، بەپێی چیرۆکی بەناوبانگی دۆزینەوەی یاســـای کێشــکردن لەلایەن نیوتنەوە، دایکت ویستویەتی بە کێشـانی وێنەی ئەم سێوە لەم مەتەڵەدا ئاماژە بکات بە نیوتن، بەتایبەت کە ئەو پەیوەندیی نیوتن بە یەکتاپەرســـتی و پاڵپشـــتیکردنی بۆ ئاریۆس زانیوە و، دەفرە قوپاوەکەش ئاماژەیە بە لەخۆگرتن، واتە ســـێوەکە نهێنیی مەتەڵەکەی تێدایە، کە بە پیتی (X) ئاماژەی بۆ کراوە و بە واتای نەزاندراو دێت.

- زۆر سوپاس پرۆفیسۆر کە ئەم کاتە پڕبایەخەت پێبەخشین.

- پێویست بە سوپاس ناکات نیزال، تۆ یەکێك بووی لە باشترین قوتابییەکانم بەدرێژایی ژیانی مامۆستاییم لە زانکۆ، سوپاست دەکەم کە باوەڕت پێکردم و لەم نهێنییە ترســـناکە ئاگادارت کردمەوە، کە منی گێڕایەوە بۆ جۆش و خرۆشی پێش خانەنشینبوونم لە زانکۆ.

- پرۆفیســـۆر کۆپییەکم لەو لاپەڕەیە بۆ هێناوی کە مەتەڵی سێوەکەی تێدایە، بۆتی جێدەهێڵم تاوەکوو بەلەسەرخۆیی بیخوێنیتەوە و لە ئەنجامەکەی ئاگادارم بکەیتەوە.

- باشە نیزال، کەمێك پێویستم بە کاتە بۆ شیکردنەوەی ژمارە و پیتەکانی خوارەوەی ســـێوەکە، دوای تەواوبوونی شـــیکردنەوەکانم ڕاستەوخۆ پەیوەندیت پێوە دەکەم.

نیزال و عبدالعزیز ماڵئاواییان لە پرۆفیســـۆر بریســـتلی کرد و پێش ئەوەی دەرگای کۆشك جێبهێڵن پرۆفیسۆر هاواریکرد و گوتی:

- نیزال، بیرم چوو شتێکی گرنگت پێبڵێم، ببوره بۆ هەموو ئەو شتانەی لە ڕابردوودا ڕوویاندا.

نیزال زەردەخەنەیەکی کرد و هەوڵی دا هەستەکانی بشارێتەوە و بەهێواشی گوتی:

- کێشە نییە پرۆفیسۆر، ئەوەی لە ڕابردوو ڕوویداوە بووەتە بەشێك لە ڕابردوو و لەبیر کراوە، سڵاوی تایبەتیم بە کاترین بگەیەنە!

کاتێك لە دەرگای کۆشك هاتنە دەرەوە، عبدالعزیز لە نیزالی پرسیی:

- نیزال پرسیارێکم بە مێشکدا هات، کاتێك گوێم لە ڕوونکردنەوەکانی پرۆفیسۆر گرتبوو؟

- پرسیارەکەت چی بوو؟

- پرۆفیسۆر بریستلی لەسەر چ ئایینێکە؟ من دەزانم کە کاترین پێش ئەوەی ببێتە مسوڵمان مەسیحییەکی پرۆستانت بوو، بەڵام هیچ ڕوکارێکی ئاییندارییم لە باوکیدا بەدینەکرد!

- پرۆفیسۆر پاڵدەدرێتە لای ئەو گرووپەی کە پێیان دەوترێت (اللاأدريه) (نازانم)، یان (ئەگنۆستییەکان - Agnosticism).

- واتە ئەو بێباوەڕە؟

- نەخێر، عبدالعزیز، بێباوەڕ کەسێکە نکۆڵی لە بوونی خودا بکات، (لائەدریەکان) هەڵوێستی میانەیان هەیە لەنێوان باوەڕداری و بێباوەڕی، واتە ئەوان نە باوەڕیان بە خودا هەیە نە بێباوەڕیشن، بەڵکوو پێیان وایە ئەم کارە غەیبییانە ناکرێت بزانرێت، لەبەرئەوەی ئەوان لە

بنەڕەتدا باوەڕیان بە ئایینەکان نییە، ئەگەرچی بەزۆری لە ناخیاندا باوەڕیان بەوە هەیە هێزێك ئەم گەردونە بەڕێوە دەبات.

- عبدالعزیز پرسـیی: بەڵام شـارەزای مێژووی ئایینەکانە و، قسەکانی دەربارەی ئاریۆس و ئاریۆسییەکان وای پیشان دەدا سۆزی بۆ بیرۆکەی یەکتاپەرستی هەیە، ئەم دژیەکییە چییە؟

- لە ڕابردوودا لەنێوان من و پرۆفیسۆر لەم کۆشکەدا چەندین گفتوگۆی توونـد ڕوویانداوە دەربارەی باوەڕ، هاوڕێ دەتوانم دڵنیات بکەمەوە کە بەرگریی پرۆفیسۆر لە ئاریۆس لە ڕوگەیەکی ئیمانییەوە نییە، چونکە پرۆفیسـۆر باوەڕی بە پێغەمبەرایەتیی مەسیح نییە و، پێی وایە مەسـیح تەنیا چاکسـازێکی کۆمەڵایەتیی بەنی ئیسـرائیل بووە، بەڵام زۆرێك لە زانایانی ڕۆژئاوا لە نموونەی پرۆفیسـۆر تۆماس بریستلی هێندە خاوەن ویژدانن و ڕاستگۆن لە زانستەکەیان کە لەوانەیە لای زۆرێك لە ئاییندارەکان بوونی نەبێت، ئەوان دەزانن چۆن جیاکاری بکەن لەنێوان ڕاستییە مێژوویی و زانستییەکان و هەست و بیروباوەڕیان.

- باشـە، ئێسـتا پلانت چییە؟ ئایە دەبێت چاوەڕوانی شـیکردنەوەکانی پرۆفیسـۆر بین بۆ مەتەڵی سێوەکە، کە کۆپییەکت پێدا؟

- کاتێکی زۆرمان لەبەردەسـت نییە تا لەدەسـتی بدەین عبدالعزیز، لەبیرت بێت بکوژانی دایکم کۆپییەکی لێکۆڵینەوەکەیان

لەبەردەستە و، بەزوویی بۆیان دەردەکەوێت زانیارییەکانی بەردەستیان کەموکوڕیی هەیە، بۆیە پێویستە خێرا جوڵە بکەین.

- ئێستا پێویستە چی بکەین نیزال؟

- دەمەوێت لە شتێك دڵنیا ببمەوە، تاوەکوو لەوە تێبگەین بۆچی حەشاشییە تازەکان هێندە سوورن لە گەیشتن بە نهێنیی ئاریۆس، خۆت ئامادە بکە سبەی نوێژی عەسر لە مزگەوتی ناوەندی لەندەن دەکەین، لەوێ چاومان بە شێخێك دەکەوێت بە ناوی سالح داود، کە هەمیشە نوێژەکانی لەو مزگەوتە دەکات، لە یەکێك لە بۆنەکاندا گوێم لە وتارێکی ئەو شێخە ئەزهەرییە بوو، زانیاریی سەیری باس دەکرد دەربارەی ئاریۆس و ئاریۆسییەکان، بەداخەوە لەو کاتەدا نە من و نە هیچ ئامادەبوویەك گرنگیمان بە قسەکانی نەدا، بەڵام ئێستا دەزانم قسەکانی زۆرێك لە ڕووداوە نادیارەکانی پەیوەست بە ئاریۆس و ئاریۆسییەکانمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

- بەڵام هەر ئێستا لە پرۆفیسۆرەوە گوێبیستی چیرۆکەکەیان بووین؟

- ئەوەی ئێستا گوێبیستی بووین گێڕانەوەی مێژووی مەسیحییەتە دەربارەی ئاریۆس و یەکتاپەرستان، بەیانی لە شێخ سالحەوە گوێبیستی چیرۆکێکی ئیسلامی سەیر دەبین دەربارەیان!

- بەڵام پەیوەندیی ئاریۆس و ئاریۆسییەکان چییە بە ئیسلامەوە؟

- عبدالعزیز، نامەی پەیامبەری ئیسلامت لەبیرە بۆ هیرەقلی ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بێزەنتی؟ ئەو نامەیەی پەیامبەر (صلی الله علیه وسلم) وشەکانی شیاوی تێڕامانن، ئێستا دەمەوێت بیر لە واتاکانی ئەو نامەیە بکەیتەوە:( فإن تولیت فعلیك إثم الاریسیین)!

**فإن تولیت فعلیك إثم لاریسیین**



دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز نوێژیان تەواو کرد لە مزگەوتی ناوەندی لەندەن، نیزال لەنێو نوێژخوێنەکاندا بەدوای شێخ سالّح داوددا گەڕا بەڵام نەیدۆزیەوە، پرسیاری لە چەند نوێژخوێنێك کرد، پێیان گوت ئێستا ماڵی گواستووەتەوە بۆ شوێنێکی دووری مزگەوتەکە و نیزال توانیی ژمارەی شێخ پەیدا بکات لە یەکێك لە نوێژخوێنەکان، ڕاستەوخۆ پەیوەندیی پێوە کرد و پێی ڕاگەیاند لەپێناو چی هاتووە و پێشی ڕاگەیاند خۆی و هاوڕێکەی حەزدەکەن سەردانی بکەن، شێخ پێی ڕاگەیاند ئێوارەی هەمان ڕۆژ سەردانی ماڵەکەی بکەن لە ناوچەیەکی دەوروبەری لەندەن، نیزال و عبدالعزیز لە کاتێکی

دیاریکراودا بەرەو ئەو ناونیشـــانە بەڕێ کەوتن کە شـــێخ پێی دابوون، دوای یەکترناسین، نیزال چیرۆکەکەی بۆ شێخ سالح گێڕایەوە و پێی ڕاگەیاند کە خێزانەکەیان تووشـــی چ نەهامەتییەك بووە لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی دایکی دەربارەی ئاریۆسییەکان.

- هەر زانیارییەك هەرچەندە بچووکیش بێت دەکرێت یارمەتیدەرم بێت بۆ تەواوکردنی ئەو کارەی دایکم دەســـتی پێکردووە، گوێم لێبوو لە یەکێك لە وتارەکانت باسی ئاریۆسییەکانت دەکرد ئەو کاتە گرنگیم بە باسەکە نەدا، هەموو ئەوەی ئێستا دەمەوێت وەڵامی ئەم پرسیارەیە: ئایە ئاریۆس و ئاریۆسییەکان پەیوەندییان بە ئیسلامەوە هەیە؟

- شێخ سالح گوتی: ئاریۆسـە یەکتاپەرستەکان مسـوڵمان بوون ڕۆڵەکەم!

- نیزال پرسیی: بەڵام چۆن؟ ئاریۆس پێش ناردنی پەیامبەر بە دوو سەدە و نیو ژیاوە و مردووە، چۆن دەکرێت مسوڵمان بێت؟!

- دەبێت سـەرەتا تێبگەین ئیسـلام چییە؟ ئەگەر مەبەسـت لە ئیسـلام پەیامی کۆتا پێغەمبەر محمد (صلى الله علیه وسلم) بێت، ئەوە بەدڵنیاییەوە من مەبەستم ئەوە نییە، بەڵام ئیسلام وەکوو بیروباوەڕ و ئایین ئایینێکی تازە نەبووە کە تەنیا پێغەمبەری ئێمە هێنابێتی، بەڵکوو درێژکراوەی ئەو پەیامە خواییەیە کە خودا بۆ مرۆڤی داناوە لە دێرزەمانەوە. ئیســـلام واتە ملکەچبوون بۆ فرمانەکانی خودا و بە تاکپەرستنی، ئەم ئایینە لەسەر بنەمای یەکتاپەرستی و جێبەجێکردنی فرمانەکانی خودا دێت، شـتێك نییە بەناوی (ئایینە ئاسـمانییەکان)

وەك هەندێك كەس باسی دەكەن، بەڵكوو شەریعەتی ئاسمانی جیاواز هەن كە بنەماكەیان تاكە ئایینێكی ئاسمانییە، بەڵام جگە لەوە هەموو ئەوانی تر كە پێیان دەوترێت ئایین، لەلایەن مرۆڤەوە ناونراون. بوزیەكان بەم ناوەوە ناونراون بەهۆی ناوی دامەزرێنەرەكەیەوە (گۆتاما بوزا)، یەهودییەكان ئەم ناوەیان لێنراوە بەهۆی (یەهودای كوڕی یەعقوب)، مەسیحییەكانیش خۆیان پاڵدەدەنە لای (مەسیحی كوڕی مەریەم) پێشیان دەوترێت (نصاری) بە ناوی ئەو شارەوە كە مەسیح تیایدا لە دایك بووە، یاخود بەهۆی سەرخستنی حەوارییەكان بۆی، بەڵام ئیسلام ئەو ناوەیە خودا هەڵیبژاردوە بۆ ئەو ئایینەی بۆ هەموو پێغەمبەرانی ناردووە ﴿ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلْمُسْلِمِينَ۝٧٨﴾(الحج ٧٨) ، حەزرەتی ئیبراهیم مسوڵمان بوو ﴿مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ۝٦٧﴾ (ال عمران ٦٧) ، جادووگەرەكانی فیرعەونیش مسوڵمان بوون ﴿ رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وتوَفَّنَا مُسْلِمِينَ۝١٢٦﴾ (الاعراف ١٢٦) ، هەروەها نوحیش مسوڵمان بوو ﴿فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَمَا سَأَلْتُكُم مِّنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ۝٧٢﴾ (یونس ٧٢) ، موساش لە پەیامەكەی بۆ بەنی ئیسرائیل گوتی: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوْمِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ۝٨٤﴾ (یونس ٨٤) ، هەروەها حەوارییەكانیش هاوەڵە ڕاستەقینەكانی مەسیح مسوڵمان بوون، حەزرەتی عیساش شایەدی لەسەر ئیسلامەكەیان دەدات: ﴿۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنْهُمُ ٱلْكُفْرَ قَالَ مَنْ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِ ۖ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ نَحْنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا

مُسۡلِمُونَ﴿٥٢﴾ (ال عمران ٥٢) بۆیە ئیسلام ئایینی تەواوی پێغەمبەران و شــوێنکەوتە ڕاســـتەقینەکانیانە، لەگەڵ هەندێك جیاوازی لە شەریعەتەکانیان لە سەردەمێك بۆ سەردەمێکی تر، هەندێك شت بۆ گەلێــك ڕێگەپێــدراوبوون بۆ گەلانی تر ڕێگەپێــدراو نەبوون، بەپێچەوانەشـــەوە، شـــتانێك لە ســـەردەمێك ڕێگەپێدراو بوون لە سەردەمانی تر ڕێگەپێدراو نەبوون، ئەمەش لەبەر بەرژەوەندیی خەڵکی و جیاوازیی باری کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی شارستانیەتی مرۆڤ بەپێی ســـەردەمە مێژووییە جیاوازەکان، بۆیە کاتێك یەکێك لە شـوێنکەوتوانی عیسـا بە مسـوڵمان ناودەبەین مەبەسـتمان ئەوە نییە شوێن کۆتا شەریعەتی ئیسلام کەوتوون کە پەیامبەرمان هێناویەتی، بەڵکوو مەبەســـتمان چەمکی ئیســـلامە وەکوو ئـاییـنی هەموو پێغەمبەران.

- نیزال گوتی: بەڵام چۆن زانیت ئاریۆســییەکان مســـوڵمانە ڕاستەقینەکانی شوێنکەوتەی مەسیحن؟

- شـــێخ ســـاڵح بە زەردەخەنەوە گوتی: بەڵام تۆ ناوێکی تر ئەزانی تەنـانەت ئەگەر بەگومـانیش بێـت بۆ ئەو گرووپەی شوێنکەوتەی ڕاستەقینەی مەسیح بوون؟

- نیزال پرسیی: مەبەستت چییە جەنابی شێخ؟

- مەبەســـتم ئەوەیە زۆربەی ئەوانەی نکۆڵی ئەوە دەکەن کە ئاریۆسییەکان شوێنکەوتە مسوڵمانەکانی مەسیح بوون، کە دوو سەدە پێش ناردنی پەیامبەر دەرکەوتوون، ناتوانن ناوێکی تر بۆ ئەو گرووپە

بدۆزنەوە کە شـوێنکەوتەی ڕاسـتەقینەی مەسـیح بوون، واتە ئەوان نکوڵی مسـولمانێتیی ئاریۆسـییەکان دەکەن، بەڵام هیچ جێدار (بدیل)ێکیان نییە کە ئەو بۆشـاییيە مێژووییە پڕبکاتەوە لەنێوان مەسیح و پەیامبەری ئیسلام هەیە.

- عبدالعزیز پرسیی: ببورە جەنابی شێخ کە قسەکانت دەبڕم، بەڵام مەبەستت لە بۆشایی مێژوویی چییە؟

- مەبەستم ئەوەیە نزیکەی شەش سەدە هەیە لە نێوان مەسیح و کۆتا پەیامبەر محمد (صلی الله علیه وسلم)، کە ئەمەش گەورەترین ماوەی نێوان دوو پەیامبەرە کە لە دوای یەکتریەوە هاتبن، پێغەمبەرانی پێشـوو یەك لە دوای یەك هاتوون، بەڵکوو هەندێجار لە هەمان کات چەند پێغەمبەرێك نێردراون، بەڵکوو بەنی ئیسـرائیل پێغەمبەران سـەرکردایەتییان کردوون، وەك پەیامبەر فەرمویەتی، ئەمە سـەرەڕای ئەوەی ناوی سەدان پەیامبەر لە قورئان و سوننەتدا نەهاتووە، زیاترین ماوەی نێوان دوو پەیامبەری یەك لە دوای یەك کە بۆ ماوەی سەدان سـاڵ درێژبووەتەوە ماوەی نێوان پەیامبەر مەسیح و پەیامبەر محمدە (صلی الله علیه و سلم)، کە بەدڵنیاییەوە ئەو ماوەیە خاڵی نەبووە لە باوەڕداران، خودا زەوی بێ باوەڕدار نەکردووە هیچ کاتێك، تەنیا پێش هاتنی ڕۆژی دوایی نەبێت بە هاتنی بایەك تەواوی باوەڕداران دەمرن و زەوی خاڵی دەبێت لە باوەڕداران، تێگەیشـتنمان لە مێژووی ئاریۆسـییەکان و یەکتاپەرستانی پێشـوتری وەك لوسیانی ئەنتاکی و

پۆڵسی شمشاتی دەتوانێت ئەم بۆشاییە مێژووییە پڕ بکاتەوە لە نێوان کۆتا دوو پەیامبەر هەیە.

- نیزال بە زەردەخەنەوە پرسیی: وا دیارە بەباشی شارەزای مێژووی مەسیحییەتی جەنابی شێخ؟

- زۆربەی کتێبی مێژوونوسە کۆن و نوێیەکانم خوێندووەتەوە دەربارەی شوێنکەوتوانی مەسیح، لە پەرتووکی مسوڵمانان و نامسوڵمانان، کێشەی زۆرێك لە مسوڵمانان ئەوەیە پێیان وایە نابێت پەرتووکی نامسوڵمانان بخوێنیەوە، ئەمەش پێچەوانەی سوننەتی پەیامبەر و مەنهەجی زانستییە، زانست خاوەن سروشتێکی کۆبووەوەیە و، پەیامبەریش هاوەڵانی قەدەغە نەکردووە لە ئاگاداربوون لە نووسراوەکانی نامسوڵمانان، بەڵام ئاگاداری کردوینەوە لە باوەڕکردن بە هەموو ئەوەی دەیخوێنینەوە بەبێ زانینی سەرچاوەکەی و لێکۆڵینەوە لە ڕاستیی بابەتەکە، بۆ نموونە، ئاریۆس بەتەواوی مێژووەکەی شێوێندراوە لەلایەن دوژمنەکانیەوە و کۆمەڵێك شتی دراوەتە پاڵ، کە بەتەواوی پێچەوانەیە لەگەڵ ژیان و بیروباوەڕەکانی کە شوێنکەوتوانی لێیان وەرگرتووە، بەڵام لە هەمان کاتدا زۆر شتی ڕاستیان دەربارەی نووسیوە بەتایبەت مێژوونوسە ڕۆژئاواییەکانی ئەم سەردەمە و، زۆرێك لەو شێواندنەیان لابردووە کە دوژمنانی بۆیان داتاشیوە.

- نیزال پرسیی: ئایە لە پەرتووکی مسوڵمانان هیچ شتێك هاتووە دەربارەی ئاریۆس و ئاریۆسییەکان؟

- شێخ سالح گوتی: بەڵێ، نامەکەی پەیامبەر بۆ (هیرەقل) خودی وشەی ئاریۆسیەکانی تێدا هاتووە.

- مەبەستت ئەو ڕستەیە کە پەیامبەر فەرمویەتی (فعليك اثم الاريسيين) (تاوانی ئاریۆسیەکانیشت دەکەوێتە ئەستۆ)؟ بەڵام جەنابی شێخ بەباشی لەیادمە لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی ئەمەمان خوێندووە و نووسەرەکان وایان لێکداوەتەوە کە (ئاریسیین) واتە (الفلاحين) (جوتیارەکان)!

- عبدالعزیز گوتی: منیش لە مەغریب هەمان لێکدانەوەم خوێندووە.

- ڕاستە بەشێك لە زانایان وشەی ئاریۆسییەکانیان بە جوتیارەکان لێکداوەتەوە، پێشیان وایە بۆیە پەیامبەر تەنیا ناوی جوتیارەکانی لە نامەکەی هێناوە، چونکە جوتیارەکان گەورەترین چینی ناو کۆمەڵگەی ڕۆمەکان بوون، بەڵام ئەم لێکدانەوەیە بەتەواوی پێچەوانەی مێژووە، چونکە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی سەدان هەزار سەربازی هەبوو، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە دەریاوان و بازرگان و ئاسنگەر و دارتاش، کەواتە بۆچی دەبێت پەیامبەر تەنیا باسی ئەم چینەی کۆمەڵگا بکات؟ هەروەها بۆچی پەیامبەر وشەی ئاریۆسییەکانی لە هیچ فەرمودەیەکی تر باس نەکردووە لەم نامەیە نەبێت کە بۆ هیرەقلی ناردووە، جگە لەوەش ڕۆمەکان خۆیان (ئاریۆسییەکان - The Arians) بەو کەسانە پێناسە دەکەن کە شوێنکەوتەی بیری ئاریۆسن، بەهەرحاڵ ئەم لێکدانەوەیە تەنیا

ئیجتیهادێکی ئەو زانایانە بووە، قســـەکانیان قورئان نییە تاوەکوو بەناچاری شوێنی بکەوین، بەتایبەت کە زانایانی تر هەن لێکدانەوەی جیاوازیان هەیە بۆ ئاریۆس و ئاریۆسییەکان.

- مەبەستت گوتەکانی ئیبن حەزمی ئەندەلوسییە؟

- نەك تەنیا ئیبن حەزم، زانایانی تریش باسی ئاریۆسییەکانیان کردووە، بەڵام جیاوازیی ئیبن حەزم ئەوەیە خۆی لە ئەندەلوس ژیاوە، کە ژمارەیەکی زۆر مەســـیحی تێدا ژیاوە و، ئەندەلوس گۆڕەپانێکی مێژوویی گرنگی ئاریۆسییەکان بووە پێش ئەوە.

- دووبارە نیزال پرسـیی: مەبەسـتت دەوڵەتی ئاریۆسـی قوتە خۆرئاواییەکانە؟

- بەڵێ، نیزال، ئەنـدەلوس لەبەردەسـتی ئـاریۆسـییە یەکتاپەرسـتەکان بوو نزیکەی سـەدە و نیوێك دوای ئەوەی قوتە خۆرئاواییەکان کۆچیان کرد بۆی و لە ئیسپانیا و فەرەنسا و بەشێکی پرتوگال دەوڵەتێکی یەکگرتویان دروسـت کرد جیا لە ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی سیانەپەرست، بەدڵنیاییشەوە ئیبن حەزم زانیاریی زیاتر بووە دەربارەی چیرۆکی ئاریۆسـییەکان لە هەندێك زانای دیکە کە تێکەڵاوییان لەگەڵ مەسـیحیەکان نەبووە، ئیبن حەزم لە پەرتووکی (الفصل فی الملل والاهواء والنحل ) دەربارەی ئاریۆسییەکان دەڵێت: بەشێك لە مەسیحییەکان شوێنکەوتووی ئاریۆسن، کە قەشەیەك بووە لە ئیسـکەندەرییە، بانگەشـەی یەکتاپەرسـتی کرد و ڕایگەیاند کە عیسـا بەندەیەکی خودا بووە و بە فرمانی خودا دروسـت بووە وەکوو

دروستبوونی زەوی و ئاسمانەکان، لەسەردەمی قوستەنتینی یەکەم، بنیادنەری قوستەنتینیە (ئیستانبوڵی ئێستا) ژیاوە و یەکەم پاشای ڕۆم بووە کە بۆتە مەسیحی و لەسەر مەزهەبی ئاریۆس بووە!

- عبدالعزیز گوتی: واتە ئیبن حەزمی ئەندەلوسی دڵنیا بووە کە ئاریۆس یەکتاپەرست بووە و باوەڕی وابووە کە مەسیح بەندەیەکی دروستکراو بووە، ئەمەش گوتەیەکی پرۆفیسۆر بریستلی دووپات دەکاتەوە کە دوێنی پێیگوتین ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە ئاریۆسییەکی یەکتاپەرست بووە!

- نیزال گوتی: ئایە زانای ناوداری تر هەن باسی شتی تریان کردبێت دەربارەی یەکتاپەرستی ئاریۆسییەکان جەنابی شێخ؟

- ئیبن تەیمییە لە پەرتووکی (الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح) نامەی پیاوێکی مسوڵمان دەهێنێت بە ناوی حەسەنی کوڕی ئەیوب کە پێشتر مەسیحی بووە، لەم نامەیەدا حەسەن باسی هەندێك لە هۆکارەکانی مسوڵمانبوونی دەکات و دەربارەی بیروباوەڕی ئاریۆسییەکان لەم نامەیەدا هاتووە: (کاتێك سەیری نووسینی مەسیحییەکانم کرد بینیم بەشێکیان بە ئاریۆسی ناسراون و بانگەوازی یەکتایی خودا و بەندەبوونی مەسیح دەکەن و، باسی هیچ یەك لەو شتانە ناکەن کە گرووپە مەسیحییەکانی تر بانگەشەی بۆ دەکەن لە خوایەتیی مەسیح و کوڕی خودا بوون...هتد، ئەوان دەستیان گرتووە بەو ئینجیلەی مەسیح هێناویەتی و قوتابییەکانی لێیان وەرگرتووە.)

هەروەها ئیمام ئەبو فەتحی شەهرستانی لە پەرتووکی (الملل والنحل)

دەربارەی ئاریۆس دەڵێت: ( کاتێك ئاریۆس گوتی: خودا هەر لە ئەزەلەوە هەبووە و مەسیح بەندەیەکی دروستکراوە، کەشیش و قەشەکان لەشاری قوستەنتینییە کۆ بوونەوە بە ئامادەبونی پاشاکەیان).

- عبدالعزیز گوتی: مەبەستی کۆنگرەی نیقییەیە کە ئیمپراتۆر قوستەنتینی گەورە ئامادەی بوو.

- ڕاستە، کۆنگرەی نیقییە، وا دیارە تۆش وەکوو هاوڕێکەت زانیاریت زۆرە دەربارەی ئاریۆسییەکان.

- عبدالعزیز بە زەردەخەنەوە گوتی: زۆر نا جەنابی شێخ، بەڵام دوێنێ خولێکی چڕوپڕم بینی دەربارەی مێژووی ئاریۆسییەکان لەلایەن نیزال و مامۆستا مێژووزانە ئینگلیزییەکەی تۆماس بریستلییەوە.

- نیزال دووبارە پرسیی: چ زانایەکی تر شتێکی هاوشێوەی گوتووە دەربارەی یەکتاپەرستیی ئاریۆس؟

شێخ سالح بۆ ساتێك وەستا و سەیری چاوەکانی نیزالی کرد، پاشان گوتی: ڕۆڵە، تێبینی ئەوەم کردووە گرنگی زۆر ئەدەیت بە ڕای زانایانی مسوڵمان دەربارەی ئاریۆس، هەندێکم بۆ باسکردی، هەندێك زانای دیکەش پێچەوانەی ئەوەیان باس کردووە و، زۆربەی زانا کۆنەکانیشمان هیچیان دەربارەی باس نەکردووە، ئەمەش واتای ئەوە نییە تۆ نەتوانی هەوڵبدەی و شتێکی تازە باس بکەی کە زانایانی پێشوو باسیان نەکردبێت!

- بەڵام چۆن دەکرێت کەسێکی وەکوو من زانستێکی تازە بهێنێت کە زانا گەورەکانی پێشوومان باسیان نەکردبێت؟! ئایە بەڕاستی دروستە لەم سەردەمەدا زانستێك بهێنیت زانایانی پێشوو باسیان نەکردبێت؟!

- باش گوێم لێبگرە ڕۆڵە، سەرەڕای پێغەمبەرایەتی و دەسەڵاتدارێتی، خودای گەورە زانست و زانیارییەکی زۆری بە سولەیمان پێغەمبەر بەخشی بوو، ئەو زمانی باڵندەکان و مێروولە و تێکڕای گیانلەبەرانی تری دەزانی و با بە فرمانی خودا دەیگواستەوە بۆ هەرشوێنێك ویستبای و، خودا مرۆڤ و جنۆکە و ئاژەڵی کردبووە سەربازی ژێردەستی، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو زانست و زانیاری و توانایەی هەیبوو، نەیتوانی ئەو زانیارییە بزانێت کە سەربازێکی سادەی پێی گەیشت، ئەو سەربازەی یەکێك نەبوو لە زانایان، فەقیهێك نەبوو لە فەقیهەکان، بەڵکوو تەنیا ئاژەڵێکی بچووك بوو، توانی بە زانستێك بگات یەکێك لە پێغەمبەرانی خودا پێی نەگەیشت، نەك لەبەرئەوەی (هودهود) زیرەکتر یان بەهێزتر، یان بەتواناتر بوو لە سولەیمان پێغەمبەر، سولەیمان پێغەمبەر یەکێك بوو لە گەورەترین پاشاکانی زەوی ئەگەر گەورەترینیان نەبێت، بەڵکوو لەبەرئەوەی (هودهود) خاوەنی دوو باڵی بچووك بوو دەیتوانی پەرواز بکات بە ئاسماندا و بگاتە شوێنێك کە سولەیمان پێغەمبەر نەیدەتوانی پێی بگات، ئەمەش نەنگی نییە لە پەیامبەر سولەیمان، بەڵکوو ئەوە سوننەتی ژیان و سروشتی دروستکراوەکان و جیاوازیی شتەکانە،

لەوانەیە ئەوەی هودهود زانیبێتی سـولەیمان پێغەمبەر نەیزانیبێت، ئەوەش پێغەمبەر سولەیمان دەیزانی لەوانەیە داودی باوکی نەیزانیبێت، ئەوەش کە تۆ بە حوکمی بارودۆخ و ئەزمونەکانت لە ژیان دەیانزانی لەوانەیە من نەیـانزانم، ئەوەش من بە حوکمی خوێنـدن و ئەزمونە تایبەتییەکانم دەیزانم لەوانەیە مامۆسـتاکەم نەیزانیبێت کە فێری نووسـینی کردم، ئەمەش لە ڕێزی کەس کەمناکاتەوە و، واتـای گەورەیی کەس نییە بەرانبەر ئەوی تر، بەدڵنیـاییەوە سـولەیمان پێغەمبەر باشـتر بوو لە هودهود، بەڵام ئەوە ڕێگری لەوە ناکات هودهود شـتێك بزانێت سـولەیمان پێغەمبەر نەیزانێت، ئەمەش بەهۆی توانا تایبەتییەکانی و هەوڵە تاکە کەسـییەکانی، لەوانەشـە بەهۆی زیرەکی و هەوڵی دۆزینەوەی شـتی نوێوە بێت. پێش هەمووشـتێك نابێت لەبیرمان بچێت هەرشـتێك ئەوەی بۆ ئاسـان دەکرێت کە بۆی دروستکراوە، بۆیە سولەیمان پێغەمبەر تووڕە نەبوو کاتێك هودهود ئەو شتەی پێگوت کە ئەم نەیدەزانی، بەڵکوو بەپێچەوانەوە کردیە نێردراوی تایبەتی خۆی بۆ شـانشـینی (سـەبەو)، ئەمەش ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر شتێك بەڵگەیە لەسەر دانایی و باوەڕبەخۆبوونی، بەپێچەوانەی زۆر کەسـەوە کە ئیرەیی دەبەن بە خەڵکی لەسـەر ئەو چاکانەی خودا پێی بەخشـیون، یاخود لەسـەر زانسـتێك کە ئەوان جارێ پێی نەگەیشتوون، ئەگەر ئەم جیاوازییە نەبوایە لە ئاستی زانستی خەڵکی ئەوا پێشـکەوتنە زانسـتییەکان نەدەهاتنە دی بەدرێژایی مێژوو شـارسـتانیەتی مرۆڤ پێش نەدەکەوت، ئەو کاتە تەواوی مرۆڤایەتی

لە یەك ئاستدا دەبوون، سەرەڕای ئەوەی ئیرەیی دادەنرێت بە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکان کە هەموو ئەو کەسانە لەپێناوی دەجەنگن کە زانستێکی تازە دادەهێنن، بەڵام ناشبێت ئەو دیاردە مرۆییە لەیاد بکەین کە بەدرێژاییی مێژوو دووبارە دەبێتەوە، هەمیشە کەسانێك هەن دژی هەموو نوێگەرییەکن و لە گۆڕانکاری دەترسن و، بەدرێژاییی تەمەنی بەفیرۆچوویان شتێك زیاد ناکەن و جێدەستیان لەم ژیانە جێناهێڵن، بۆیە ئەگەر توانیت زانستێك زیاد بکەیت کە پێش تۆ کەس پێی نەگەیشتووە، ئەوا دوودڵ مەبە و، لە نرخی خۆت کەم مەکەرەوە بە قسەی کەسانی دەوروپشتت، مرۆڤ دوژمنی ئەو شتانەیە کە نایزانێت، خۆت زۆر سەرقاڵ مەکە بەو هێرشانەی کەسانی تر دەیکەنە سەرت، بە هۆی گومانی خراپیان لە نیەتەکانت، یاخود لەبەر کەمیی تێگەیشتنیان لە قسەکانت، لەپێش تۆش زۆرێك لە زانایان کە ئێستا سەرچاوەی زانستی قوتابییانی زانستن هێرشیان کراوەتە سەر و، تۆمەتبار کراون بەوەی شتانێکیان هێناوە پێشینانیان باسیان نەکردووە، ئەگەر ئەو زانایانە خەریکبان بە وەڵامدانەوەیان و لاوازیان و خۆیان بەدەستەوە دابا هەوڵەکانیان بەبا دەچوو، ئێستا ئەو زانستە بە ئێمە نەدەگەیشت کە ملیۆنان مرۆڤ سوودی لێدەبینن بەدرێژاییی مێژوو، تەنیا نیەتت خاوێن بکەرەوە لە کارەکەت و پشت بە خودا ببەستە، بەدوای ناوبانگ و بەرژەوەندیدا مەگەڕێ، زانستی بەسوود لە هەموو کەسێك فێربە بەبێ جیاوازی، هەمیشە ئەو گوتەیەت لەیاد بێت: ئەم جیهانە جێمەهێڵە، پێش ئەوەی جێدەستی خۆتی تێدا جێنەهێڵیت!

- نیزال گوتی: سوپاس بۆ ئامۆژگارییە بەنرخەکانت جەنابی شێخ.

- تکا دەکەم، زانینی مێژووی ئاریۆس و شوێنکەوتە یەکتاپەرستەکانی زۆرێك لە فەرمودە و ئایەتە قورئانییەکان و مێژوومان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام چۆن جەنابی شێخ؟

- خودا لە قورئاندا باسی دوو جۆر مەسیحیمان بۆ دەکات، دەربارەی مەسیحپەرست و سیانەپەرستەکان دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ﴿٧٣﴾﴾ هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴿٧٢﴾﴾ بەڵام لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾﴾ ، وەکوو لە تەفسیری بەغەویدا هاتووە، قەتادە دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتە دەفەرموێت: ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێك لە ئەهلی کیتاب دابەزی کە لەسەر ئەو ئایینە ڕاستە بوون حەزرەتی عیسا هێنای و، کاتێك خودا کۆتا پەیامبەری نارد بەڕاستیان زانی و باوەڕیان پێهێنا، لەبەرئەوە خودا ستایشی کردن لەم ئایەتەدا.

هەروەها لە سورەتی (البروج)دا خودای گەورە باسی (أصحاب الاخدود) و گەنجە باوەڕدارەکە دەکات و بە هەمان شێوە پەیامبەریش لە فەرمودەیەکدا باسیان دەکات، خودا باسی ئەو کەسانە دەکات کە خرانە ئاگرەوە و بە باوەڕدار وەسفیان دەکات ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلْبُرُوجِ ﴿١﴾

وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ۝٢ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ۝٣ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ۝٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ۝٥ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ۝٦ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ۝٧ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ۝٨﴾ ، ئەوەی جێگای سەرنجە ئەو قوربانییانەن کە قورئان چیرۆکەکەی باس کردوون، لە ڕاستیدا گرووپێکی مەسیحی یەمەنی بوون، بەدیاریکراوی لە شانشینی (حیمیەری) یەمەنی، لە زۆرێك لە تەفسیرەکان وەکوو تەفسیری قورتووبی باسیان کراوە بەوەی گەلێکی مەسیحیی یەمەن بوون.

- نیزال پرسیی: بەڵام پەیوەندیی ئەو مەسیحییە باوەڕدارانە کە خودا لە قورئاندا باسیکردون چییە بە ئاریۆسییەکانەوە؟

- عبدالعزیز پرسیی: نیزال، وتەکانی پرۆفیسۆرت لەبیرە کە دوێنێ شەو باسیکرد دەربارەی بانگخوازێکی هیندی ئاریۆسی؟

- بژیت هاوڕێ، ئێستا بیرم کەوتەوە، بانگخوازی ئاریۆسی سیۆفیۆڵسی ئەسیوبی یاخود هیندی کە ئاریۆسی لە حەبەشە و یەمەن بڵاوکردەوە.

- شێخ سالح گوتی: ئەمەش بەڵگەیە لە قورئان کە ئاریۆسییەکان باوەڕدار بوون.

- بەڵام جەنابی شێخ ئەگەر ئەوەشمان سەلماند ئاریۆسییەکان لە یەمەن هەبوون، چۆن بیسەلمێنین ئەوان ئەو گرووپە باوەڕدارەی چیرۆکی (أصحاب الاخدود)ن؟

- لەم بابەتەدا هیچ شتێك نییە سەدا سەد لێی دڵنیا بین، بەڵام ئەوە ڕای منە دەربارەی بوونی مەسیحییە باوەڕدارەکان لە

یەمەن، ئەوانەی پێچەوانەی ئەم ڕایەیان هەیە دەبێت وەڵامی سێ پرسیار بدەنەوە: ناوی ئەو گرووپە باوەڕدارە چی بوو کە لە یەمەن دەژیان؟ ئەو گرووپە مەسیحییە یەکتاپەرستە چۆن لە یەمەن بڵاوبوونەوە؟ ئاریۆسییەکانی یەمەن چییان بەسەر هات، لە کاتێکدا لە مێژوودا بوونیان سەلمێندراوە لە شانشینی (حیمیەری) یەمەنیدا لە سەردەمێك لە سەردەمەکاندا؟! سەرەڕای ئەوەش ئەم لێکدانەوەیە نهێنیی مسوڵمانبوونی نەجاشیمان بۆ ڕاڤە دەکات.

- نیزال پرسیی: پەیوەندیی نەجاشی بەم کارەوە چییە؟ مەبەستت ئەوەیە ئەمیش ئاریۆسی بووە؟

- بەڵێ، ئەم ڕاستییە لە خودی قسەکانی نەجاشی دەردەکەوێت، تێگەیشتن لە چیرۆکی ئاریۆسیەکان ڕاڤەی هۆکاری باوەڕهێنانی نەجاشی (ئەسعەمە بن ئەبجر)مان بۆ دەکات بە بانگەوازی محمد (صلى الله عليه وسلم) ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی لە هاوەڵان گوێبیست بوو کە عیسا تەنیا پەیامبەرێکە و خودا نییە، تەنانەت نەجاشی گفتوگۆی لەگەڵ هاوەڵان نەکرد دەربارەی ئەم بابەتە، کە بەڵگەیە لەسەر باوەڕی پێشوەختەی نەجاشی بەم بابەتە، دوای ئەوەی گوێی لە هاوەڵان بوو کە لە ئیسلامدا مەسیح بە خودا دانانرێت، نەجاشی قسەیەکی سەیری گوت، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو باوەڕی بە پەیامبەرێتیی مەسیح هەبووە و دژی سیانەی پیرۆز بووە: (والله ما زاد المسيح على ما تقولون نقيرا)، هەروەها دوای ئەوەی گوێبیستی قورئان بوو لە هاوەڵانەوە گوتی: (ئەوەی ئێوە دەیڵێن لەگەڵ ئەوەی

عیســـا هێنای لە یەك ســـەرچاوەوە هاتوون)، لەمەوە دەردەکەوێت نەجاشـی لەسـەر ئایینی ئاریۆسـی یەکتاپەرست بوو کە لە حەبەشـە بڵاوبویەوە بە هۆی هەوڵەکانی سیۆفیولسی هیندی یاخود ئەسیوبی وەکوو باسمان کرد.

- ئەگەر وامان دانا لێکدانەوەکەی ئێوە ڕاسـتە جەنابی شـێخ، بەڵگەت چییە لەسـەر ئەوەی نەجاشـی سـەر بەو گرووپە ئاریۆسـییە بووە؟

- شـــێخ ســـاڵح بە زەردەخەنەوە گوتی: نیزال، ئەگەر تۆ ڕای پێچەوانەی ئەوەت هەیە، دەبێت ناوی ئەو گرووپە یەکتاپەرســـتەمان پێ بڵێی کە نەجـاشـــــی یەکێك بوو لەوان، هەروەهـا چۆنیەتیی گەیشـــتنی یەکتاپەرســـتیمان بۆ حەبەشـــە بۆ ڕوونبکەیتەوە بەبێ چیرۆکی سیۆفیولسی هیندی یاخود ئەسیوبی!

- دووبارە نیزال پرســـیی: ئایە لە فەرمودەکانی پەیامبەر هیچ ئاماژەیەك هەیە دەربارەی ئاریۆسـییەکان، جگە لە نامەکەی پەیامبەر بۆ هیرەقل؟

- بەڵێ، فەرمودەیەکی ســـەیری پەیامبەر هەیە باســـی باری زەوی دەکات پێش هاتنی کۆتا پەیامبەر، فەرمودەکە لە ســـەحیحی موسـلیمدا هاتوە و دەفەرموێت: (ان الله نظر الی أهل الارض فمقتهم عـربـهـم وعـجـمـهـم الا بـقـایـا مـن اهـل الـکـتـاب). واتە ئەو گرووپەی ئەهلی کیتـاب وەکوو خەڵکەکەی تر نەبوون، من پێم وایە ئەو گرووپە کە لەســەر ڕێگای ڕاســتی مابوون ئاریۆســییە

یەکتاپەرستەکان بوون، ئەو کەسەی ڕای پێچەوانەی هەیە، دەبێت ناوی ئەو گرووپەمان پێبڵێت کە ئەم فەرمودەیە مەبەستیەتی، هەمان چیرۆکیش بەسەر چیرۆکی سەلمانی فارسیدا دەچەسپێت.

- سەلمانی فارسی چ پەیوەندییەکی بە ئاریۆسییەکانەوە هەیە؟!

# سەلمانی فارسی




شـــێخ ســـاڵح پەرتووکێکی لە یەکێك لە ڕەفەکانی پەرتووکخانەکەی دەرهێنا و بەدەم هەڵدانەوەی پەڕەکانییەوە گوتی:

- بەدڵنیاییەوە گوێبیستی چیرۆکی هاوەڵی پەیامبەر سەلمانی فارســـی بوون یاخود خوێندوتانەتەوە، ئەم هاوەڵە لە وڵاتی فارس دەستی بەسەرکەشییە درێژەکەی کرد بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەت، لە چیرۆکی ژیانیدا چەندین وشە هاتوون کە بەڵگەیە لەسـەر پەیوەندیی ئەم هاوەڵە لەگەڵ چەندین پیاوی ئایینی ئاریۆســـی کە پێیان وابووە ئایینی مەسیحی دەستکاری کراوە، ئێستاش هەندێکتان لە چیرۆکی ئەو هاوەڵە بۆ دەگێڕمەوە کە سەلمانی فارسی خۆی گێڕاویەتییەوە، تیایدا باسی چۆنیەتیی گەیشتن بە چەندین پیاوی ئایینی مەسیحی دەکات:

(فما رأيت رجلاً لا يصـــلي الخمس أرى أنه أفضـــل منه، أزهد في الدنيا ولا أرغب في الآخرة، ولا أدأب ليلاً ونهاراً منه، قال: فأحببته

حباً لم أحبه مَن قبله، وأقمت معه زماناً، ثم حضرته الوفاة، فقلت له: يا فلان! إني كنت معك، وأحببتك حباً لم أحبه أحداً من قبلك، وقد حضرك ما ترى من أمر الله، فإلى مَنْ توصي بي؟ وما تأمرني؟، قال: أي بني! والله ما أعلم أحداً اليوم على ما كنت عليه، لقد هلك الناس وبدلوا، وتركوا أكثر ما كانوا عليه إلا رجلاً بالموصِل وهو فلان، فهو على ما كنت عليه فالْحَقْ به..

قال: فلما مات وغُيب، لحقت بصاحب الموصل ، وكان له مع صاحب الموصل نفس الشأن مع سابقه ولما حضرته الوفاة سأله إلى مَنْ توصي بي؟ وما تأمرني؟ فأخبره عن رجل بنصيبين فذهب إليه، فكان له معه نفس الشأن كسابقيه حتى حضرته الوفاة، فأعاد عليه نفس السؤال فأخبره عن رجل بعمورية، قال: فلما مات وغيب، لحقت بصاحب عمورية، وأخبرته خبري، فقال: أقم عندي، فأقمت مع رجل على هدي أصحابه وأمرهم، قال: واكتسبت حتى كان لي بُقَيْرَاتٌ وَغَنَيمَةٌ، قال: ثم نزل به أمر الله، فلما حضر قلت له: يا فلان إلى مَنْ توصي بي؟ وما تأمرني؟ فقال له: إني يا بني لا أعرف أحداً على مثل ما نحن عليه ولكن قد أظلك زمان نبي، من بني إسماعيل مبعوث على دين إبراهيم عليهما الصلاة والسلام وهذا النبي سوف يخرجه قومه من أرضه مهاجراً إلى أرض بين حرتين بينهما نخل به علامات لا تخفى يأكل الهدية ولا يأكل الصدقة وبين كتفيه خاتم النبوة فإن استطعت أن تلحق بهذه البلاد فافعل.)

شێخ سالّح لە خوێندنەوە وەستا و پەرتووکەکەی داخست، پاشان گوتی:

- تەواوکەری چیرۆکەکە لای هەموان ئاشکرایە، سەلمان (خودا لێی ڕازی بێت) کۆچ دەکات بۆ مەدینە و بە پەیامبەر دەگات و باوەڕی پێدەهێنێت، دوای ئەوەی نیشانەکانی پێغەمبەرێتی تێدا بەدی دەکات کە پیاوە مەسـیحییەکە بۆی باس دەکات، بەڵام ئەوەی جێی سـەرنجە لەم چیرۆکەدا تەواوی ئەو پیاوە ئایینییە مەسـیحییانەی سـەلمان پێیان دەگات لە شـوێنی جیاوازن و، سـەر بە گرووپێکن کە ژمارەیان کەمە و کەسانێکن دەستکاری ئایینی مەسیحییان نەکردووە، بۆیە ئەم دەسـتەواژانە لە چیرۆکەکەدا بەکار هاتوون: خەڵکی لەناو چوون و ئایینەکەیان گۆڕی، وازیان لەو شـتانە هێنا کە لەسـەری بوون، بڕۆ بۆ لای چونکە ئەو لەسـەر بیروباوەڕی ئێمەیە، هیچ کەسێك شك نابەم تاوەکوو بتنێرم بۆ لای کە لەسەر هەمان بیروباوەڕی ئێمە بێت.

لە ناوەڕۆکی قسـەکانیدا دەردەکەوێت کە ئەم گرووپە یەکتاپەرسـت بوون، لەو کات و شـوێنەدا کە دەکەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی سـیانەپەرسـت، ئەمەش لە فەرمودەیەکی تردا بۆمان دەردەکەوێت هەر لەسەر زاری سەلمانی فارسی، کە حاکم لە مستدرك هێناویەتی و فەرمودەیەکی سـەحیحە، لەو فەرمودەیەدا هاتووە کە سەلمان پرسیاری لە پێغەمبەر کرد دەربارەی ئەو پیاوە مەسیحییەی لەلای مایەوە، هەروەها تێکڕای پیاوە ئایینییە مەسیحییەکانی تر کە سـەلمان پێی وابوو پیاوی باشـبوون، پەیامبەر پێی گوت کە ئەوان لەسـەر ڕێی ڕاسـت نەبوون، بەڵام سـەلمان دەیزانی کە ئەو پیاوە

مەسـیحییانەی ئەو لەلایان دەمایەوە سـەر بە گرووپێکی مەسـیحی ڕاسـت بوون، با گوێ لە سـەلمان بگرین لەو فەرمودەیەدا کە دەسـت پێ دەکـات بە ڕوونکردنەوەی هۆکـاری هـاتنی بۆ لای پەیـامبەر (صلی الله علیه وسلم).

شێخ سـاڵح پەرتووکێکی لە پەرتووکخانەکەی دەرهێناو دەستی کرد بە خوێندنەوەی:

- سـلاوم کرد و لای پەیـامبەر دانیشـتم و گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا چی دەڵێی دەربـارەی ئـایینی مەسـیحییەکـان، فەرموی: خێر لە خۆیان و ئایینەکەیاندا نییە، منیش ڕۆیشـتم و شـتێك لە دڵمدا دروسـت بوو، پاشـان خوای گەورە ئەم ئایەتەی بۆ پەیـامبەر دابەزانـد (﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾﴾) تـا کۆتـاییی ئـایەتەکە، پەیـامبەر فەرموی بـانگی سـەلمان بکەن، منیش بەترسـەوە هاتمە لای و لەبەردەمی دانیشـتم و پەیامبەر ئەم ئایەتەی تا کۆتایی بۆ خوێندمەوە، پاشـان فەرموی: ئەی سـەلمان هاوەڵەکەت و ئەو پیاوانەی لەگەڵیان مایتەوە مەسیحی نەبوون، بەڵکوو مسـوڵمان بوون، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا، سوێند بەو کەسەی تۆی ناردووە، ئەو فرمانی پێکردم شوێنت بکەوم و منیش پێمگوت: ئەگەر ئەو کەسـە فرمانم پێبکات بە وازهێنان لە ئایینەکەت و لەو ڕێگایەی تۆ لەسـەری، پێی گوتم: ئەو کات واز

لەو ئایینە بهێنە من لەسەریم، چونکە قسەکانی ئەو ڕاستن و دەبێت جێبەجێبکرێن.

- نیزال پرسیی: بەڵام جەنابی شێخ ساڵح گێڕدراوەتەوە لە ئاریۆس و ئاریۆسییەکان کە وشەی باوك و کوڕیان بەکارهێناوە، ئەم کارە چۆن لەگەڵ باوەڕێکی ڕاستدا دەگونجێت؟

- سەرەتا پێویستە باوەڕ بە هەرشتێك نەکەین کە لە ئاریۆسیەکانەوە گێڕدراوەتەوە لە گوفتار و کردار، چونکە زۆربەی ئەوەی دەربارەیان باسکراوە لە پەرتووکی دوژمنەکانیانەوە گوازراونەتەوە، هەمان ئەو کەسانەی ئایینی مەسیحییان گۆڕی، چۆن دڵنیا بین شتی تر ناگۆڕن؟! ئەو دوو وشەیە واتایان چییە؟ ئەگەر بمانەوێت لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لە هەرشتێك بکەین دەبێت بە زمانی ئەو سەردەمە لێی تێبگەین و، بە پێناسەی ئەوان وشەکە پێناسە بکەین نەك پێناسەی خۆمان، ئاشکرایە کە وشەی باوك و کوڕ لە کۆندا لای مەسیحییەکان هەمیشە مەبەستیان پەیوەندیی باوك و کوڕ نەبووە، پەرتووکی پیرۆز (بایبڵ) یەکەمین جار بە زمانی ئیغریقیی کۆن نووسراوە، کە زمانی مەسیح نەبووە، بۆیە هەندێك وشەی دیاریکراو لە ئینجیلی ڕاستەقینە گۆڕدراون کە یەکانگیر نییە لەگەڵ واتا ڕاستەقینەکەی لە زمانی عیبری یان ئارامی کە زمانی مەسیح بووە، وەکوو زانراوە لەم زمانە سامیانە باوکایەتی یان کوڕێتی ئەدرێتە پاڵ کەسانێك و یان شتانێك کە مەرج نییە هەمیشە بە پاڵنەری ڕەچەڵەك بێت، بەڵکوو بە هۆی ڕێزگرتن یان زیاد وەسفکردن،

یان بۆ زەمکردنە. ئێمە لە زمانی عەرەبی بە شتێك یاخود کەسێك دەڵێین کوڕی فلان یان باوکی فلان، ئەگەر بمانەوێت وەسف و ستایشی بکەین یان جنێوی پێبدەین، بۆ نموونە بە باوك دەڵێین (رب الاسرە)، وە کاتێك بە کەسێك دەڵێین (ابن الشارع) مەبەستمان ئەوە نییە شەقام کوڕی هەبێت بەڵکوو مەبەست شتێکی ترە، هەمان شت کاتێك بە کەسێك دەڵێین (ابن الملوك)، بۆیە کاتێك کەسێك پاڵدەدەینە پاڵ باوکێك، یان کوڕێك مەرج نییە مەبەستمان واتای ئاشکرای وشەکە بێت، بەڵکوو مەبەست پیاهەڵدان یان زەمکردن یاخود زیادەڕەویکردنە لە وەسفکردن، ئێمەش کە زمانمان عەرەبییە دەبێت لە هەموو کەس باشتر لەم بابەتە بگەین لەبەر نزیکیی زمانمان لە زمانی عیبری و ئارامی کە هەردوکیان سەر بە هەمان گرووپی خێزانی زمانی سامین. هەرچەندە بەکارهێنانی ئەم جۆرە وشانە بۆ وەسفکردنی پەیوەندیی مرۆڤە بە خوداوە، لە ناشارەزاییی ئەو کەسانەوە سەرهەڵ دەدات کە بەکاری دەهێنن، بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین پاڵدانی مەسیح بۆ لای خودای گەورە لە زمانی عیبری و ئارامی مەبەستی ڕەچەڵەك نییە، بەڵکوو مەبەستیان ڕێزگرتن و پیشاندانی ئاستی پابەندێتیی مەسیحە بە فرمانەکانی خوداوە، واتە مەبەستیان ئەوە بووە مەسیح کەسێکی چاکەکار بووە، بەڵام کێشەکە کاتێك سەریهەڵدا کە ئیغریقییەکان ئەم وشانەیان وەرگێڕا وەکوو ڕەچەڵەك، بەتایبەت کە لە کولتووری ئیغریقیی کۆن چیرۆکی زۆری خودا و کوڕی خودای تێدایە، لە کاتێکدا ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا بە واتا مەجازییەکەی

بەکارهاتووە نەك بەو واتایەی ئیغریقەکان لێی تێگەیشتن و گواستیانەوە بۆ جیهان کە پەیوەندیی ڕەچەڵەکی باوك و کوڕە، بەڵگەشمان لە خودی پەرتووکی پیرۆزە لە تەنیا یەك چیرۆك کە بە دوو شێوە وەرگێڕدراوە لە هەریەکە لە ئینجیلی مەرقەس و لۆقا. لە ئینجیلی مەرقەس ١٥:٣٩ دا هاتووە: ئەم مرۆڤە کوڕی خودایە، هەروەها لە ئینجیلی لۆقا ٢٣:٤٧دا هەمان چیرۆك هاتووە بەم وەرگێڕانەوە: ئەم مرۆڤە کەسێکی چاکەکارە، هەر بەم بۆنەیەوە ئەوان هەموو مرۆڤ بە کوڕانی خودا وەسف دەکەن نەك تەنیا مەسیح.

- نیزال پرسیی: ئیبن تەیمییە دەربارەی ئەم بابەتە چی دەڵێت؟

- ئیبن تەیمییە لە پەرتووکەکەی (الجواب الصحیح لمن بدل دین المسیح)دا دەڵێت: وشەی کوڕ لە پەرتووکی ئەهلی کیتاب ناوە بۆ ئەو کەسەی خودا پەروەردەی کردووە، یاخود هەڵیبژاردووە و ڕێزی لێگرتووە لەنێو بەندەکانی وەکوو یەعقوب و داود و سولەیمان و پێغەمبەرانی دیکە، چونکە وشەی باوك لە زمانی ئەوان بە واتای پەروەردگار دێت، ئەو کەسەی بەندەکانی پەروەردە دەکات باشتر لە پەروەردەی باوك بۆ منداڵەکەی، لەم بارەیەوە ئەم وتەیە دەدەنە پاڵ مەسیح کە بە قوتابییەکانی گوتووە: (دوژمنەکانتان خۆشبوێت، لەگەڵ دوژمنەکانتان چاکە بکەن، نزا بکەن بۆ ئەو کەسانەی خراپن بۆتان و دەرتان دەکەن، بۆ ئەوەی ڕۆڵەی ئەو پەروەردگارەتان بن کە لە ئاسمانەکانە!)

- نیزال پرسیی: کەواتە ئەوە چۆن لێکدەدەیتەوە کە ئاریۆسییەکان باوەڕیان بە لەسێدارەدانی مەسیح هەبووە؟ بۆ نموونە شاژنە هێلانە خۆی دامەزرێنەری ئەو شتەیە کە ئەمڕۆ پێی دەگوترێت (خاچی پیرۆز)، چۆن دەکرێت مسوڵمان بووبێت و باوەڕی بە لەسێدارەدانی مەسیح هەبێت؟

- شێخ سالّح گوتی: سەیر بکە نیزال، ئێمە باسی کەسانێك دەکەین کە پێش دابەزینی ئایەتی ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَـٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ ژیاون، بەدڵنیاییەوە ئەوانیش وەکوو مەسیحییەکانی تر نەیانزانیوە کە مەسیح لە خاچ نەدراوە بەڵکوو بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، ئەوان پێیان وابووە کە ڕۆمانەکان مەسیحیان لە خاچ داوە، بەپیرۆزگرتنی خاچ لای ئەوان تەنیا بەپیرۆزگرتنی شتێکە کە خوێنی پێغەمبەرە شەهیدەکەیانی لەسەر ڕۆیشتوە بەپێی باوەڕی ئەوان. ئەوان لە بنەڕەتدا مەسیحیان نەپەرستووە هەموو ئەو نەهامەتی و مەینەتییانەی بەسەریان هاتووە بە هۆی ڕەتکردنەوەی خوایەتیی مەسیحەوە بووە، کەواتە چۆن دەکرێت خاچ بپەرستن کە بەپێی بیروباوەڕی ئەوان مەسیحی لەسەر لە خاچ دراوە؟ تەنانەت ئەگەر ئەوەشمان سەلماند کە ئەوان خاچیان کردووەتە دروشمی خۆیان، ئەمە واتای پەرستنی خاچ ناگەیەنێت، ئەگەرچی لادانی بیروباوەڕیان هەبووە لە ئەنجامی نەزانین یاخود بە گەورەکردن، ژمارەیەکی زۆر مسوڵمانی ئەم سەردەمەش زیادەڕەوی دەکەن لە خۆشویستنی پێغەمبەر و هاوەڵانی و ئالی بەیت و پیاوچاکان، بەشێوەیەك کە

چاوەڕوانی شتی وایان لێدەکەن کە پێچەوانەی بنەماکانی یەکتاپەرستین، بەڵام زۆربەی ئەم کەسانە بەهانەی نەزانینیان هەیە، واتە ناتوانین بڵێین بێباوەڕن ئەگەرچی کارەکانیان لادانی زۆری تێدابێت، بەڵکوو لەجیاتیی ئەوە دەبێت فێربکرێن و ئامۆژگاری بکرێن بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت. هەمان شتیش ڕاستە دەربارەی ئاریۆس و ئاریسییەکان، ئەگەرچی ئەوەش دەزانین کە بەشی زۆری ئەوەی دەربارەیان نووسراوە لەلایەن دوژمنە سەرکەوتوەکانیانەوە بووە، بەڵام ئەمەش ڕێگر نابێت لەوەی لەوانەیە ئاریۆس و ئاریسییەکان هەندێك لادانی بیروباوەڕیان هەبووبێت لە بەگەورەکردنی مەسیح، چونکە ئەو کەسانە سێ سەدە دوای لەدایکبوونی مەسیح ژیاون و پەرتووکێکی ڕاستیان لەبەردەست نەبووە بۆی بگەڕێنەوە وەکوو قورئانی پیرۆز، ئەگەر واشمان دانا کە ئەوان شتی نائاساییان داوەتە پاڵ مەسیح، بەڵام نابێت هەرگیز ئەو ڕاستییە چەسپاوەمان لەیاد بچێت کە ئەوان مەسیحیان نەپەرستووە و پێیان وابووە مەسیح دروستکراوێکی خودایە، بە هۆی باوەڕیان بە یەکتاییی خودا و ڕەتکردنەوەی سیانەی پیرۆز و خوایەتیی مەسیح، بۆ سەدان ساڵ بەشێوەیەکی دڕندانە لەلایەن سیانەپەرستەکانەوە کوژراون و سزادراون و دەربەدەر کراون.

عبدالعزیز پرسیاری کرد: بەڵام بۆچی ئاریۆسییەکان دوای ناردنی پەیامبەر ون بوون؟

- ئاریۆسییەکان تاکوو ئەو سەردەمەش دەچەوسێنرانەوە لەلایەن ڕۆمانە سیانەپەرستەکانەوە، لەوانەیە ئەمەش نامەکەی پەیامبەرمان بۆ لێکبداتەوە کە بۆ ئیمپراتۆر هیرەقلی نارد: بەڵام ئەگەر ڕوو وەرگێڕی تاوانی ئاریۆسییەکانیشت دەکەوێتە ئەستۆ. لەوانەیە مەبەستی پەیامبەر ئەوە بووبێت چیتر ناهێڵێت یەکتاپەرستە ئاریسییەکان بکوژرێن و بچەوسێنرێنەوە لەلایەن ڕۆمە سیانەپەرستەکانەوە، زۆرێکیش لە مەسیحییە ئاریسییەکان مسوڵمان بوون لەگەڵ گەیشتنی ئیسلام پێیان و، یەکێکیش لەوانە نەجاشی بوو، لەبەرئەوەی پەیامە یەکتاپەرستییەکەی محمد (صلى الله عليه وسلم) یەکانگیر بوو لەگەڵ بیروباوەڕی یەکتاپەرستیی ئەوان، هەروەها ژمارەیەکی زۆر لە قیبتییەکانی میسر مسوڵمان بوون ڕاستەوخۆ دوای گەیشتنی عەمری کوڕی عاص.

- دووباره عبدالعزيز پرسیی: ئایە یەکتاپەرستەکان لە میسر هەبوون؟

- شێخ ساڵح وەڵامیدایەوە: مێژوونووسی کەنیسەی قیبتی یوحەنای نقیۆسی کە ئەمیش سیانەپەرست بوو تەئکید لەوە دەکاتەوە ئەو کەسانەی میسرییەکان ناویان نابوون (بێباوەڕ) یاخود (مەسیحییە درۆزنەکان) چونە پاڵ سوپای مسوڵمانان لە دژی ڕۆمەکان، یوحەنای نقیۆسی لە پەرتووکەکەی (مێژووی میسر)دا دەڵێت: ئێستاش، زۆرێك لە میسرییەکان کە مەسیحی درۆزن بوون و بیروباوەڕی ئەرسەدۆکسی پیرۆزیان ڕەت دەکردەوە، بوونەتە مسوڵمان

- نیزال پرسیی: ئاریسییەکانی تری دونیا چییان بەسەر هات؟

- زۆربەی ئەوانەی لە کۆمەڵکوژیی سیانەپەرستەکان ڕزگاریان بوو شـــوێنی بانگەوازی ئیســـلام کەوتن، ئەمەش نیمچە ونبوونی مەزهەبی ئاریۆســـیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە دوای دەرکەوتنی ئیســـلام، هەروەها خێراییی بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیســـلام لەناو گەلی ئەمازیغ لە بـــاکووری ئەفریقیـــا بۆ هەمـــان هۆکـــار دەگەڕێتەوە، چونکە ئەمازیغەکان زۆربەیان یەکتاپەرســـتی ئاریۆســـی بوون، لەبیریشـــمان نەچێت کە خودی ئاریۆس ئەمازیغی بوو لە باکووری ئەفریقیا، بۆیە زۆربەی ئەمـــازیغییەکـــان لەســـەر مەزهەبەکەی بوون، هەربۆیەش ئەمازیغییەکان بەخۆشـــحاڵییەوە ڕێیان بە کۆچی هۆزەکانی ڤاندال و ئالانی یەکتاپەرســـت دا بۆ وڵاتەکەیان و، بەیەکەوە دژایەتیی ڕۆمە سیانەپەرستەکانیان دەکرد و، بۆماوەی سەد ساڵ بەیەکەوە بوون لە چوارچێوەی دەوڵەتێکی بەهێزی ئاریۆســـی لە باکووری ئەفریقیا بە ناوی مەملەکەتی ڤاندال، ئەمەش ئەوەمـان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هەندێك لە نووسەرە مسوڵمانەکان گوتوویانە کە ئەمازیغییەکان لەسەر ئایینی جولەکە بوون پێش هاتنی ئیسلام، چونکە ڕۆمەکان مەسیحییە یەکتـاپەرســـتەکـانیـان بە جولەکـایەتی تۆمەتبـار دەکرد، بۆیە مســـوڵمانبوونی گەلێکی بەتوانا و بەهێزی وەکوو گەلی ئەمازیغ بەتەواوی بەم خێراییە بەهۆی ئەوەوە بوو کە لە بنەڕەتدا ئاریۆسییەکان یەکتاپەرست بوون، زۆربەی ئەمازیغەکانی باکووری ئەفریقیا لەسەر ئەو ئیسلامە بوون کە مەسیح پێش چەند سەدەیەك هێنابووی. بۆیە

کاتێك مسوڵمانان بە پەیامی ئیسلامەوە هاتن تاوەکوو ڕزگاریان بکەن لەدەست ڕۆمە سیانەپەرستەکان کە خاکیان داگیر کردبوون و دەیان چەوساندنەوە، ئەمازیغەکان پێشوازییان لێکردن، پێیان وانەبوو کە داگیرکەرن بەڵکوو لایان وابوو برای ئایینی یەکترن، بۆیە هەر بەوەوە وازیان نەهێنا کە مسوڵمان بوون و باوەڕیان بە پەیامەکەی محمد(صلی الله علیه وسلم) هێنا، بەڵکوو بوونە سەرکردە لە سوپای ئیسلام، سەرکردەی ئیسلامی تاریقی کوڕی زیاد سەرکردایەتیی هەزاران ئەمازیغی و عەرەبی کرد بۆ ڕزگارکردنی ئەندەلوس لە فەرمانڕەوا سیانەپەرستەکانیان، ئەمازیغییەکان بەدرێژاییی مێژوو و ئێستاش لە بەهێزترین سەرخەرەکانی ئیسلام و مسوڵمانان بوون، چەندین سەرکردەی گەورە و زانای ناوداریان پێشکەشی ئیسلام کردووە، کە بەشدار بوون لە بەرەوپێشبردنی شارستانیەتی ئیسلامی.

- عبدالعزیز پرسیی: گوتت ئازادکردنی ئەندەلوس جەنابی شێخ؟

- بەڵێ، دەتوانین بڵێین ئازادکردنی ئەندەلوس لەلایەن تاریقی کوڕی زیادەوە ڕزگارکردنی خەڵکەکەی بوو لە سەرکردە سیانەپەرستەکانیان، چونکە ئەندەلوس بەتەواوی لەژێردەستی دەوڵەتێکی ئاریۆسی بوو بۆماوەی زیاتر لە سەدە و نیوێك، قوتە خۆرئاواییەکان دانیشتوانی ڕەسەنی ئەندەلوس لە هۆزە جەرمانییە ئاریۆسییەکان بوون، ڕایان کرد بۆ ئەندەلوس لەدەست ڕۆمانە سیانەپەرستەکان و لە ئەندەلوس دەوڵەتی ئاریۆسی قوتە

خۆرئاواییەکانیان دامەزراند، ئایینی مەسیحی ئاریۆسی ئایینی ڕەسمیی ئەم دەوڵەتە بوو، پێش ئەوەی یەکێك لە پاشاکانی قوتە خۆرئاواییەکان بە ناوی ڕیکاردۆی یەکەم ( Recardo۱) ببێتە کاسۆلیکی لە ساڵی ٥٨٦ز، بەمەش خەڵکە یەکتاپەرستەکەی بە زەبری شمشێر ناچار کرد ببنە کاسۆلیك، بەجوانی سەیری ئەم مێژووە بکە پێش ئەم ڕێکەوتە بە ١٧ساڵ پەیامبەر لە دایك بوو.

- نیزال گوتی: کەواتە پەیامبەر لە سەردەمێکدا لە دایك بوو کە یەکتاپەرستی بەرەو لەناوچوون دەچوو لە جیهاندا!

- ئەمەش نهێنیی دەرکەوتنی پەیامبەرمان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەدیاریکراوی لەو سەردەمە، ئەو ئیسلامەی کە مەسیح هێنابووی و چەندین سەدە بەردەوام بوو، پێش هاتنی پەیامبەر بەرەو لەناوچوون دەچوو لە جیهان، گەردوون ئامادە بوو بۆ پێشوازیکردن لە کۆتا پەیامبەری یەکتاپەرست، کە شوێنکەوتوانی دووبارە یەکتاپەرستییان گێڕایەوە بۆ سەر زەوی.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە ئەمە هۆکاری خێرا ئازادکردنی ئەندەلوسمان بۆ لێکناداتەوە لەسەردەستی تاریقی کوڕی زیاد؟

- لە ڕاستیدا هیچ لێکدانەوەیەکی لۆژیکی نییە بۆ خێرایی ئازادکردنی شارە سەخت و چیایەکانی ئەندەلوس لەسەردەستی مسوڵمانان، تەنیا بە تێگەیشتن نەبێت لە مێژووی ئاریۆسییەکان، چونکە ئازادکردنی ئەندەلوس ڕزگارکردنی دانیشتوانە ڕەسەنەکەی بوو لە قوتە خۆرئاواییەکان کە یەکتاپەرست و ئاریۆسی بوون لە ستەم

و چەوساندنەوەی پاشا سیانەپەرستەکانیان، پێش ئازادکردنی لەلایەن تاریقی کوڕی زیاد ئاریۆسە یەکتاپەرستەکانی ئەندەلوس و جولەکەکان تووشی ستەمێکی ترسناك دەبوون لەسەردەستی فەرمانڕەوا سیانەپەرستەکان و هاوپەیمانە ڕۆمەکانیان. سەرچاوەکانی مێژوو باسی ئەوە دەکەن زۆرێك لە یەکتاپەرستان بەرەو مەغریب ڕایان کرد بۆ پاراستنی ئایینەکەیان، کە ئەمانە پاڵپشتیی مسوڵمانان بوون لە ئازادکردنی ئەندەلوس، بۆیە کاتێك تاریقی کوڕی زیاد بە ژمارەیەکی زۆر کەمی سەرباز بەرەو ئەندەلوس پەڕینەوە، خەڵکەکەی ئەوانیان بە ئازادکەر دایە قەڵەم لە ستەمی فەرمانڕەوا سیانەپەرستەکانیان، بۆیە باس نەکراوە لە مێژوودا هیچ شۆڕشێك لەلایەن گەلی قوتی لە دژی مسوڵمانان سەریهەڵدابێت لە سەرەتای فەرمانڕەواییان، بەڵکوو بەپێچەوانەوە شار دوای شار بەخێراییەکی سەرسوڕهێنەر ئازاد کران و زۆربەی دانیشتوانی نیمچە دوورگەی ئیبیری بەخێرایی مسوڵمان بوون، بەتایبەت کە پرتوگالیش پێشتر لەژێردەستی سوەیبییە ئاریۆسییەکان بوو. بۆیە سەیر نییە کە ئیسلام نزیکەی هەشت سەدە لە ئەندەلوس مایەوە، تاوەکوو دووبارە سیانەپەرستەکان مەزهەبی کاسۆلیکی بە زەبری شمشێر و ئاگر بچەسپێنن بەسەر دانیشتوانەکەی لە ڕێی دادگا ترسناکەکانی پشکنین.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە جولەکەکان ڕۆڵیان هەبوو لە ئازادکردنی ئەندەلوس لەلایەن مسوڵمانانەوە؟

- له (كۆنگرەی سـێیەمی تولەیتلەوە ( Third council of Toledo - له سـالّی ٥٨٩ز، پاشـای کاسـۆلیکی قوتە خۆرئاواییەکان، یاسای چەوساندنەوەی دژی جولەکە و ئاریۆسییەکان دەرکرد و ناچاری کردن ببنە کاسـۆلیك، لە کۆتاییدا ئەم یاسـایە گەیشـتە ئاسـتێك جولەکەکانی وەکو کۆیلە سـەیر دەکرد و بەپێی ئەم یاسـا کاسـۆلیکییە منداڵانی جولەکە بەزۆر لە دایك و باوکیان وەردەگیران تاوەکوو پەروەردەیەکی کاسـۆلیکی بکرێن، ئەمەش وای لە جولەکەکـان کرد پەنـا ببەنە ژیـان لە دەرەوەی شـارەکـان. ئەم چەوسـاندنەوەیەی جولەکە و ئاریۆسـییەکان ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە سەرچاوە مەسیحییەکان باسیان کردووە بەوەی جولەکەکان یارمەتی مسـوڵمانانیان داوە لە ئازادکردنی ئەندەلوس و پارێزگاریکردن لە شارە ئازادکراوەکان، جولەکەکان گوێبیسـتی ئازادیی ئایینی و لێبوردەیی ئیسـلام ببون کە جولەکە و مەسـیحییەکان لەژێر سـایەی دەوڵەتی ئیسـلامی هەیانبوو لەو شـارانەی مسـوڵمانان ڕزگاریان کردبوو لەدەستی ڕۆمەکان، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە مێژونووسە ئیسـلامییەکان ئاماژەی پێدەکەن بەوەی مسـوڵمانان جولەکەیان هێناوە بۆ شـارە ئازادکراوەکان و پشـتیان پێبەسـتوون لە پاراسـتنی، هەروەها سـەرچاوە ئیسـلامی و خۆرئاواییەکان یەکدەنگن لەسـەر ئەوەی جولەکەکان لانی کەم ڕۆڵێکی لۆجسـتییان هەبووە لە یارمەتیدانی مسـوڵمانان لە ئازادکردنی ئەندەلوس و پاراسـتنی شـارە ئازادکراوەکان. بەم شـێوەیە جولەکە و مەسـیحییەکان بە هەموو مەزهەبەکانیانەوە بۆ

ماوەی سەدان ساڵ لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی ژیان لە ئەندەلوس، تاوەکوو کەوتنی غەرناتە و داگیرکردنی لەلایەن مەسیحییە سیانەپەرستەکانەوە، دووبارە مەسیحییە کاسۆلیکییەکان دەستیان کردەوە بە جەنگی لەناوبردنی بەکۆمەڵ دژی دانیشتوانە ڕەسەنەکەی ئەندەلوس لە مسوڵمان و جولەکە و تەنانەت مەسیحییەکانیش ئەوانەی لەسەر مەزهەبی کاسۆلیك نەبوون، کە لە مێژوودا ناسراوە بە دادگاکانی پشکنینی ئیسپانی، مسوڵمانان بەتایبەت لە سەردەمی دوو براکەی بەربەڕۆسا هەستان بە ڕزگارکردنی دەیان هەزار جولەکە لەو ستەم و ئازارەی تێیدابوون لەژێر سایەی فەرمانڕەوایی قشتاڵییە کاسۆلیکەکان. کەشتیی مسوڵمانان هەستان بە گواستنەوەیان بۆ کەنارە ئاوییە ئیسلامییەکان تاوەکوو بەئازادی بژین لە خاکی مسوڵمانان لە باکووری ئەفریقیا و شارە ئیسلامییەکانی تر.

- عبدالعزیز گوتی: ڕاستە، زۆرێك لە جولەکەکانی مەغریب لە بنەڕەتدا دەگەڕێنەوە بۆ ئەندەلوس.

- نیزال گوتی: جەنابی شێخ بە پرسیارەکانمان بێزارمان کردی، بەڵام ڕێم پێبدە کۆتا پرسیارت لێبکەم کە ئێستا بە خەیاڵمدا هات، ئایە ئاریۆس و ئاریۆسییەکان هیچ پەیوەندییەکیان بە چیرۆکی یارانی ئەشکەوت (أصحاب الکهف)ەوە هەیە؟

- ئیمامی بەغەوی لە تەفسیری سورەتی کەهفدا باسی ئەوە دەکات کە یارانی ئەشکەوت دوای هەستانەوەیان کەسێکیان نارد بۆ شار تاوەکوو خواردنیان بۆ بکڕێت، کاتێك خەڵکی شار پارەکەیان

پێبینی وایان زانی گەنجینەیەکی دۆزیوەتەوە، بۆیە بردیانن بۆ لای سەرۆکی شار و کاربەڕێکەرەکەی کە کاروباری ئەو شارەیان بەڕێوە دەبرد، ئیمامی بەغەوی ئەو دوو کەسە بە پیاوچاك وەسف دەکات، باسی ئەوەش دەکات کە یەکێکیان ناوی ئاریۆس و ئەویتریان ناوی ئەستیۆس بووە، هەر ئەم دوو کەسەش چیرۆکی یارانی ئەشکەوتیان ئاشکرا کرد.

- نیزال پرسیی: ئایە ئەو پیاوچاکەی بەغەوی باسی دەکات هەمان ئاریۆسە کە باسی دەکەین؟

- دڵنیانیم لەوە، بەڵام بە لێکدانەوەی ماوەی خەوتنیان کە دەکاتە سێ سەد ساڵی زایینی و ئەو ماوەیەی ئاریۆس تێیدا دەرکەوت، من وەکوو خۆم باوەڕناکەم هەمان ئاریۆس بێت، بەڵکوو تەنیا لێکچونی ناوەکانە و، بابەتەکە پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیاترە، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە وەسفی بەغەوییە بۆ ئەو کەسە بە پیاوی چاك. لە میانەی چیرۆکەکەوە دەردەکەوێت کە دوو پیاوەکە و خەڵکی شارەکە باوەڕداری یەکتاپەرست بوون، بۆیە بیریان کردەوە مزگەوت لەسەر گۆڕەکانیان دروست بکەن، لە کۆن و ئێستاشدا خەڵکی منداڵەکانیان بە ناوی پیاوچاکانەوە ناودەنێن وەکوو پیرۆزی، ئەگەر ئاریۆس ئەمازیغییەکی بێباوەڕ بوایە لە ڕوانگەی ئەو خەڵکەوە، منداڵەکانیان بەو ناوەوە ناو نەدەنا!

- نیزال گوتی: جەنابی شێخ سالّح سوپاس بۆ میوانداری و ڕێزگرتنت، بە وتەکانت و ڕوونکردنەوە جوانەکانت زۆرێك لە بابەتە مێژووییە ئالّۆزەکانت بۆ ڕوون کردینەوە.

- هیوادارم خودا سەرکەوتووتان بکات و هەرکاتێك هاتنە لام بەخێربێن، خواتان لەگەڵ.

# پلانی دەستبەسەرداگرتنی مرۆڤایەتی

دوای ئەوەی دوو هاورێکە ماڵئاواییان لە شێخ ساڵح داود کرد، ڕوویان کردە وێستگەی میترۆکانی ژێرزەویی نزیك ماڵی شێخ، لە ڕێگادا عبدالعزیز لە نیزالی پرسیی:

- نیزال، بەتەواوی دەتویست چیبزانی لە بینینی ئەم شێخە بەڕێزە؟

- دەمویست ئەوە بزانم کە گرووپێکی شەڕخوازی وەکوو حەشاشییە تازەکان لەبەرچی بەدوای نهێنییەکی مێژوویی شاردراوەی وەکوو نهێنیی ئاریۆسدا دەگەڕێن. پێشتر پێم وابوو کە ئامانجەکەیان دەستکەوتنی سامانە بۆ دامەزراندنی دەستە تاوانکارییەکەیان، بەڵام ئێستا و دوای دەستکەوتنی ئەم زانیارییانە بۆم دەرکەوت ئامانجەکەیان زۆر لەوە ترسناکترە!

- ئەم ئامانجە ترسناکە چییە؟

- ئەوان هەوڵی کۆنترۆڵکردنی مرۆڤایەتی دەدەن، تەنانەت دەستبەسەرداگرتنی مرۆڤایەتی هاندەری یەکەمی ڕێکخراوی حەشاشییەکان بوو لە کۆندا، لەم میانەیەشدا حەسەن سەباحی سەرکردەیان دەستەیەکی پیاوکوژی ترسناکی دروست کرد، کە هەڕەشەی لە دەوڵەتە بەهێزەکانی ئەوسای جیهان دەکرد و، توانییان لە ساتێك لە ساتەکان هاوسەنگیی نێودەوڵەتیی هێز بگۆڕن، حەشاشییە

تازەکانیش هەوڵی گەڕانەوەی هێزە کۆنەکەیان دەدەن، بەجێبەجێکردنی هەمان شێوازی کۆن لە بنیادنانی هێزە نوێیەکەیان.

- مەبەستت ئەوەیە ئەوان حەشیش بەکاردەهێنن بۆ زاڵبوون بەسەر ژیریی مرۆڤەکاندا؟

- بەدڵنیاییەوە نەخێر، عبدالعزیز، حەسەن سەباح لەڕێگای حەشیش بەسەر ژیریی شوێنکەوتوانی زاڵ نەدەبوو، حەشیش تەنیا هۆکارێکی یاریدەدەر بوو نەك زیاتر لە کردەی زاڵبوون بەسەر ژیریی کەسەکان، حەشاشییەکان لەژێر کاریگەریی حەشیش نەبوون بەدرێژاییی کات وەکوو هەندێك کەس وا بیردەکەنەوە، بەڵکوو ئەوان هەڵدەستان بە ئەنجامدانی کردەوە ترسناکەکانیان کاتێك لەوپەڕی ئاگاییدابوون.

- کەواتە چۆن سەرکردەی حەشاشییەکان توانییان ئەم جۆرە مرۆڤە بکوژانە دروست بکەن کە تەنانەت هەندێك کات ئامادە بوون خۆشیان بکوژن؟!

- لە ڕێگای ئایینەوە.

- عبدالعزیز گوتی: ئایین؟!

- گوێبگرە هاوڕێ، هیچ شتێك هێندەی ئایین کە لە ئیمانەوە سەرچاوەی گرتبێت ناتوانێت مرۆڤ ملکەچ بکات بۆ ڕێنمایەکانی. ئەمە ڕاستییە. هەموو ئەو کەسانەی ویستویانە دەست بەسەر مرۆڤایەتیدا بگرن هەر لە کۆنەوە درکیان پێکردووە، بۆیە زۆرێك لە سەرکردە و فەرمانڕەوایانی سەر زەوی بەدرێژاییی مێژوو پەنایان بۆ

زاڵبوونی ئـایینی بردووە، لەبەرئەوەی زانیویـانە تەنیـا لەم ڕێیەوە دەتوانن بەتەواوی زاڵ بن بەسـەر ژیریی گەلەکانیان، بۆیە سـوربوون لەسەر دروستکردنی پەرستگاکان لە دڵی ئەو شارانەی فەرمانڕەوای بوون. مەرج نییە لە خۆشـەویسـتیی ئەو خواوەندەوە بێت کە خەڵکەکە پەرسـتوویانە، بەڵکوو لە خۆشـەویسـتیی ئەو دەسـەڵاتە بووە کە ئەو پەرسـتگایانە بۆیان فەراهەم کردوون، لە هەمان کاتدا هەوڵیان داوە زانایانی ئایینی و کاهینی پەرسـتگاکان ڕابکێشـن بۆ لای خۆیان، ئەمانەش پیرۆزییەکی ئایینییان داوە بەو سـەرکردە و پاشـایانە و باوەڕیان بە خەڵکی هێناوە کە کوێرانە بەگوێیان بکەن، بە تێپەڕبوونی کات کارەکە پەرەی سـەندووە و هەندێك لەو سـەرکردانە بانگەشـەی خوایەتییان بۆ خۆیان کردووە، چونکە دەیانزانی لەم ڕێیەوە پشتگیریی تەواوی گەلەکانیـان بۆ فەراهەم دەبێت، بەم شـێوەیە لە ڕوانگەی گەلەکـانیـان ئەم سـەرکردانە دەگۆڕان بۆ خواوەندێك کە نەدەکرا پێچەوانەی فەرمانەکانی بکەن تەنانەت گفتوگۆشـی لەسـەر بکەن، فیرعەونەکان بانگەشـەی خوایەتییان دەکرد و پەرسـتگا و پەیکەریان بۆ خۆیان دروسـت کرد و وێنەکانیان لە هەموو شـوێنێك هەڵواسـرا تاوەکوو بیری گەلەکانیان بخەنەوە کە دەبێت ملکەچی فەرمانەکانیان بن، هەروەها ئیمپراتۆری چین (شی هوانگ (Qin shihuang) ئەو ئیمپراتۆرەی چینی یەك خسـت و دیواری مەزنی چینی بنیاد نا، بانگەشەی خوایەتیی دەکرد و بەمەش دەستی بەسەر چینییەکاندا گرت. ئارەزووی زاڵبوون پاشای یۆنانی

(ئیسکەندەری گەورە (Alexander the Great - و پاشای ڕۆمانی (کالیگیولا - (Caligula ی پەلکێش کرد تاوەکوو بانگەشەی خوایەتی بکەن لە کۆتاییی ژیانیاندا. پیرۆزیی ئایینی شوێنکەوتەی دڵسۆزی وەهای بۆ سەرکردەکانیان دابین کردوە لە مێژوودا، کە ئامادە بوون گیان ببەخشن لەپێناو پاشا پیرۆزەکەیان لە ڕوانگەی ئەوانەوە. حەسەن سەباح و سەرکردەی حەشاشییەکان باش درکیان بەمە کردبوو، هەر بۆیەش ئایینە باتینییەکەیان بەکار دەهێنا بۆ زاڵبوون بەسەر ژیریی حەشاشییەکان و، توانییان ترسناکترین سوپای پیاوکوژ لە مێژوودا دروست بکەن، کە ئامادە بوون خراپترین تاوانەکان جێبەجێ بکەن، بەبێ ئەوەی ترس بچێتە دڵیانەوە کە پڕ کرابوو لە باوەڕ، هەرچەندە باوەڕەکەیان باوەڕێکی پوچەڵ بوو، بەڵام لە کۆتاییدا باوەڕ بوو. دڵێکی باوەڕداریش زۆر بەهێزترە لەو دڵەی کە باوەڕی بە هیچ بنەما و بنچینەیەك نییە جا باوەڕەکە باش بێت، یان خراپ.

- ئەمە واتا پاڵنەری ئایینی بزوێنەری ڕاستەقینەی حەشاشییەکان بووە نەك خودی حەشیش!

- بەڵێ، عبدالعزیز، حەشیش تەنیا بەکار هاتووە بۆ بێهۆشکردنی ژیریی شوێنکەوتوانی و ڕێگرتن لێیان لەوەی لۆجیکییانە بیربکەنەوە لە کاتێکی دیاریکراو کە تیایدا وەهم و خەیاڵ لەو ژیرییە بێهۆشکراوانە چێنراون. نیزال بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی: هەمان شت ڕۆژانە بۆ ئێمەش دووبارە دەبێتەوە!

- بەڵام چۆن؟

- عبدالعزیز هەرگیز نەتپرسیوە بۆچی کۆمپانیاکانی بەرهەمهێنانی خواردنەوە گازییەکان و کۆمپانیا بەرهەمهێنەکانی تر سوورن لەسەر دروستکردنی ڕیکلام بە بەکارهێنانی مۆسیقای بەرز و کاریگەریی دەنگی، کە کەشێکی پڕ لە جوڵە و خێرایی بەرهەم دەهێنێت، بەڵام هەمان شت لە ڕیکلامی بەرهەمە پزیشکییەکان نابینرێت، کە تیایدا تەرکیز دەخرێتە سەر سروشتی خودی بەرهەمەکە؟ لە حاڵەتی یەکەم بەرهەمهێنەری ئەو ڕیکلامانە دەیانەوێت مێشکی بەکارهێنەرانیان بێهۆش بکەن لە ڕێگای ئەو مۆسیقا و کاریگەرییە دەنگیانەوە، کە ئەمەش دەبێتە بەربەست لەبەردەم بیرکردنەوەی کەسەکە لە پێکهێنەرەکانی بەرهەمەکە، بەپێچەوانەی حاڵەتی دووەم کە مەبەست دواندنی ژیرییە نەك هەستی کەسەکان، بۆ نموونە، کاتێك مرۆڤ دەرمانێك دەکڕێت دەیەوێت پێکهێنەرەکانی و سوودە تەندروستییەکانی بزانێت. هەمان شت جادووگەرەکان بەکاری دەهێنن بۆ ئاسانکردنی فێڵکردن لە خەڵکی، ئەمەش لە ڕێگای پیشاندانی کارە جادووگەرەکانیان کە بەزۆری لە شوێنی تاریك و لەژێر کاریگەریی مۆسیقایەکی ترسناك دەبێت، لەبەر هەمان هۆکار پیاوانی ئایینیی هەندێك لە ئایینەکان سوورن لەسەر دروستکردنی پەرستگاکانیان لە شوێنی تاریك و دەورەدراو بە پەیکەر و وێنەی ترسناك، چونکە ترس توانای ژیری کەم دەکاتەوە بۆ بیرکردنەوەی

لۆژیکییانه و وای لێدەکات بەئاسانی قبووڵی هەموو بیرێکی پوچ بکات!

- عبدالعزیز پرسیاری کرد: بەڵام تا ئێستا تێنەگەیشتوم حەشاشییەکان چ سوودێك لە نهێنیی ئاریۆس دەبینن؟ ئاریۆسییەکان یەکتاپەرست بوون، ئایە حەشاشییەکان دەیانەوێت یەکتاپەرستی لەنێو شوێنکەوتوانیان بڵاوبکەنەوە؟

- بەپێچەوانەوە، خودی بیرۆکەی یەکتاپەرستی تا ئێستاش بیرۆکەیەکی ترسناکە بۆ هەموو ستەمکارانی مێژوو، یەکتاپەرستی واتە یەکلابوونەوەی مرۆڤ بۆ پەرستنی خودا بەتەنیایی و ملکەچنەکردن بۆ هیچ دروستکراوێکی تر هەر پلەیەکی هەبێت، بۆیە ستەمکاران دژایەتی یەکتاپەرستییان کردووە بەدرێژاییی مێژوو، لەبەرئەوە ئیبراهیم و موسا و عیسا دژایەتی کران لەلایەن پاشا ستەمکارەکانەوە، هەروەها کیسرا و هیرەقل لەو هەڕەشەیە تێگەیشتن کە پەیامە یەکتاپەرستییەکەی محەممەد (صلی الله علیه وسلم) لەسەر کورسییەکانیان دروستی دەکرد کە لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای داپلۆسینی گەلەکانیان بنیاد نرابوو، بۆیە جەنگیان لە دژی ڕاگەیاند. بەدرێژایی مێژووش سەرکردە ستەمکارەکان دژایەتی هەرکەسێکیان کردووە کە بانگەوازی یەکتاپەرستیی ڕاستەقینەی کردبێت، ئەو کاهینانەشیان لەخۆیان نزیك کردووەتەوە کە بازنەیەکی پیرۆزیان بەدەورەوە دروستکردوون.

- دووباره عبدالعزیز پرسیاری کرد: کەواتە چ هۆکارێك وا لە حەشاشییە تازەکان دەکات بەدوای نهێنیی ئاریۆسی یەکتاپەرستدا بگەڕێن؟!

- ئەم ڕێکخراوە نهێنییە دەیەوێت لەم ڕێگایەوە دەست بگرێت بەسەر جیهان، چونکە مێژووی ئاریۆسی پەیوەستە بە دوو گەورەترین ئایینی سەر ڕووی زەوی، مەسیحیەت و ئیسلام. ئەگەر حەشاشییە تازەکان بتوانن بەم نهێنییە بگەن پێش کەسانی تر و مێژووی ئاریۆسی یەکتاپەرست بگۆڕن بەو شێوەیەی خزمەت بە بەرژەوەندییەکانیان دەکات و لەڕێگای دروستکردنی هەر ئەفسانەیەك کە بیانبەستێتەوە بە ئاریۆس و ئاریۆسییەکان، بەم شێوەیە و بەم ئەفسانەیە دەتوانن شوێنکەوتووی تازە لە بڕواداران دروست بکەن بەتەواوی وەك چۆن پێش سەدان ساڵ ئەو کارەیان کرد، لەکۆندا شوێنکەوتوانیان بە سەدان بوو، بەڵام ئێستا تەنیا بە گەیشتن بە نهێنیی ئاریۆس دەتوانن ملیۆنان باوەڕداری بکوژی شارەزا دەست بخەن بە ئەفسانە تازەکەیان. عبدالعزیز دەتوانی بیر بکەیتەوە زەوی چی بەسەردێت ئەگەر ئەم تاوانکارانە بتوانن پلانە ترسناکەکەیان جێبەجێ بکەن! لەبیرشت نەچێت کە هۆزە جەرمانییەکان زۆربەیان ئاریۆسی بوون، بیربکەرەوە چی ڕوودەدات ئەگەر هاوپەیمانێتی دروست بکرێت لەنێوان حەشاشییە تازەکان و نازییە تازەکان کە هەوڵدەدەن بۆ بەجێهێنانی خەونی هیتلەر بە دروستکردنی (رایخ

ئەڵمانیای گەورە - Greater Germanic Reich) بەبێ گومان داهاتوی مرۆڤایەتی دەکەوێتە مەترسییەوە ئەگەر توانییان....

دوای ئەوەی نیزال و عبدالعزیز لەسەر کورسییەکانیان دانیشتن لەناو میترۆکە، نیزال مۆبایلەکەی دەرهێنا تاوەکوو لەڕێگای ئینتەرنێتەوە هەندێك وێنە پیشانی عبدالعزیز بدات، بینیی پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی ٢٠ جار هەوڵی داوە پەیوەندی پێوە بکات، بۆیە وازی لە قسەکردن هێناو ڕاستەوخۆ پەیوەندیی کردەوە بە پرۆفیسۆرەوە:

- نیزال تۆ لەکوێی؟ دوو کاتژمێرە هەوڵدەدەم پەیوەندیت پێوە بکەم!

- ببورە پرۆفیسۆر لە مزگەوت بووم و مۆبایلەکەم بێدەنگ کردبوو پاشان بیرم چوو بیکەمەوە سەر باری ئاسایی.

- هەر ئێستا دەمەوێت بتبینم، ئەو فایلەشم بۆ بێنە کە لەلاتە، دۆزیمەوە!

- ببورە پرۆفیسۆر، ئێستا فایلەکە لەلامە، بەڵام چیت دۆزیەوە؟

- سێوەکە نیزال، سێوەکە، ئەوە ئینگمایە!

- چیت گوت پرۆفیسۆر؟ دەتوانی دووبارەی بکەیتەوە چونکە من لە میترۆدام و بەباشی گوێم لە دەنگت نییە!

- ئەوە ئینگمایە، پرۆفیسۆر وەڵامیدایەوە، پێش ئەوەی پەیوەندییەکە لەناکاو بپچڕێت.

دوای ئەوە یەکســەر نیزال لاپەڕەی نهێنییەکەی لە گیرفانی دەرهێناو بەبێ دەنگی لێی دەڕوانی، پاشان هاواری کرد:

- ئەی خوایە، چۆن ئــاگــاداری ئەوە نەبووم؟ لبەڵێ ئەوە ئینگمایە!

نیزال و عبدالعزیز لە نوسینگەکەی پرۆفیسۆر تۆماس بریستلی دانیشتبوون و، گوێیان لە پرۆفیسۆر گرتبوو کە ئاماژەی بە هێماکانی ناو لاپەڕەی مەتەڵی سێوەکە دەکرد:

- لە دوێنێوە هەوڵی شیکارکردنی ئەم هێمایانە دەدەم، بەڵام بێ ئەنجام بوو، ئەمڕۆ کاتێك چاوم بە کتێبخانەکەمدا دەگێڕا چاوم کەوتە سەر گۆڤارێکی مێژوویی کە وێنەی سەرکردەی نازییەکان ئەدۆلف هیتلەری لەسەر بوو، لە پشتیەوە هێمای نازی هەبوو، دووبارە سەیری ئەم لاپەڕەیەم کردەوە کە مەتەڵی سێوەکەی تێدایە، ڕاستەوخۆ تێگەیشتم ژمارە و پیتەکانی ناو ئەم مەتەڵە لەسەر بنەمای زمانی ئینگمای نهێنیی نازی نووسراون!

- عبدالعزیز گوتی: پرۆفیسۆر بریستلی، دەتوانی چیرۆکی ئەو ئینگمایەم بۆ باسبکەی کە نیزالی هاوڕێمی شێت کردووە و لەناو میترۆکە هەر دووبارەی دەکردەوە ئەوە ئینگمایە، لەو کاتەوەی تۆ پەیوەندیت کردووە من تکای لێدەکەم کە پێم بڵێت ئەم وشەیە واتای چییە، بەڵام ئەو بەدرێژاییی کات بێدەنگ بوو، لە ڕوانینەکانی تێگەیشتم چووەتە جیهانێکی تر کاتێك پەڕەکانی هەڵدەدایەوە.

- (ئینیگما (Enigma - وشەیەکی ئینگلیزییە بە واتای (مەتەڵ) یاخود شتێکی ئاڵۆز دێت، ئەمیش کورتکراوەی (ئامێری ئینیگما -(Enigma Machine یە، کە ئەمیش ناوێکە بە

هەر ئامێرێك دەوترێت لە ئامێرەكانی كارۆمیكانیكی خولاوە كە بۆ دروستكردنی شیفرەی نهێنی، هەروەها شكاندنی شیفرە نهێنییەكان بەكاردێت. لە سەرەتاكانی سەدەی بیستەوە ئەم ئامێرانە لەلایەن زۆرێك لە دەزگا سیخوڕی و سەربازی و حوكومییەكانی زۆرێك لە وڵاتانەوە بەكاردێت، ئەڵمانیای نازی لە كاتی جەنگی دووەمی جیهانی و پێش ئەوەش لە بەناوبانگترین بەكارهێنەرانی ئەم ئامێرەبوون. ئەڵمانەكان پەرەیان بە شێوە ئەڵمانییەكەی ئەم ئامێرە دابوو و ناویان نابوو (ویرماخت ئینیگما Wehrmacht Enigma) - واتە ئینگمای هێزە چەكدارەكان، ئەم ئامێرە ئەڵمانییە باشترین بوو لەنێو هاوشێوەكانی، ئەمەش بە هۆی ئاسانی بەكارهێنانی و نیمچە مەحاڵی شكاندنی كۆدەكانی، ئەمەش وایكردبوو هێزی سەربازیی نازی پشتی پێببەستێت بۆ نووسینی نامە نهێنییەكانی، كە بۆ سیخوڕەكانی دەنارد لە سەرتاسەری جیهان و ژێردەریاییە شەڕكەرەكانی لەژێر ئاوی دەریاكان. ئەڵمانەكان بە هۆی بەكارهێنانی زمانی ئینگمای نهێنی توانییان سەركەوتنی گەورە تۆمار بكەن لە سەرەتای جەنگی دووەمی جیهانی، ژێردەریاییە ئەڵمانییەكان لە تەواوی ئاوەكانی جیهان دەگەڕان و ئامانجەكانیان دەپێكا، بەبێ ئەوەی هیچ كەسێك بتوانێت شوێنەكانیان دیاری بكات، ئەمەش بە هۆی بەكارهێنانی ئینیگما لەلایەن نازییەكان بۆ ناردنی ڕێنماییەكان و ناوی ئەو شوێنانەی پێویستە وێران بكرێن، ژێردەریاییە نازییەكان توانییان زۆرێك لە كەشتییەكانی وڵاتانی هاوپەیمان ژێر ئاو بخەن

بەتایبەت کەشتییەکانی بەریتانیای گەورە، کە دەزگا سیخوڕییەکانی توانای شکاندنی کۆدەکانی ئینگمایان نەبوو.

- عبدالعزیز پرسیی: ئایە شکاندنی کۆدەکانی ئینیگما تا ئەم ئاستە قورس بوو؟

- پێم وابێت وشەی (مەحاڵ) ڕاستترە لە وشەی (قورس) بۆ وەسفی کۆدەکانی ئینگمای نازییەکان، ئەڵمانەکان هەموو نیوەشەوێك کۆدی بەکارهێنراویان دەگۆڕی و یەکەمین نامەیان لە شەشی بەیانی دەنارد، ئەمەش واتە دەبوو دەزگا سیخوڕییەکان زیاتر لە ١٥٠ ملیۆن ملیۆن کۆد تاقیبکەنەوە لەماوەی ١٦کاتژمێردا بۆ شکاندنی کۆدی ڕۆژێك!

- نیزال گوتی: عبدالعزیز ئەمە واتە ١٥٠ و لەلای ڕاستی ١٨ سفر هەبێت!

- لەگەڵ داگیرکردنی بەشی زۆری ئەوروپا لەلایەن هیتلەرەوە بە ستراتیژیی (جەنگی هەورەبروسکە) (Blitzkrieg) و لەناوبردنی کەشتییە بەریتانییەکان یەك لەدوای یەك لەلایەن ژێردەریاییە نازییەکانەوە، دەزگای سیخوڕی دەرەوەی بەریتانیا (ئێم ئای ٦ - (MI٦ کارەکانیان چڕ کردەوە لەماوەی جەنگ بۆ شکاندنی کۆدەکانی ئینگما. لەم میانەیەشدا گرووپێکی نهێنی پێکهێنرا لە دیارترین کەسە لێهاتووەکانی بەریتانیا و سیخوڕەکانی و تایبەتمەندانی زمانی کۆد، کاری سەرەکیی ئەم گرووپەش: شکاندنی کۆدەکانی ئینیگما بوو!

- عبدالعزيز پرسيی: پرۆفيسۆر، ئايە ئەم گرووپە توانييان ئەم كارە بكەن؟

- دوای ساڵانێك لە كاری نهێنيی چڕوپڕ، ئەم گرووپە نهێنييە توانييان كۆدی ئينيگما بشكێنن، ئەم كارەش بووە هۆی ئاشكرابونی شـوێنی تەواوی ژێردەرياييە ئەڵمانييەكان لە جيهاندا و، گەنجينەيەك زانياريی هەواڵگريی نهێنيی نازييەكان و سـيخوڕەكانيان و پلانەكانی دا بە بەريتانييەكان. سـاتی شـكاندنی كۆدی ئينيگما خاڵێكی وەرچەرخـان بوو لە مێژووی جەنگی دووەمی جيهـانی و بەمەش هاوكێشـەكە لە بەرژەوەنديی وڵاتانی هاوپەيمان شـكايەوە. كاتێك بەريتانييەكان تەواوی زانيارييە دەستكەوتووەكانيان بەخشييە وڵاتانی تری هاوپەيمان، ئەم زانيارييانە ڕۆڵی گرنگيان هەبوو لە گۆڕينی ئاڕاستەی زۆرێك لە جەنگە يەكلاكەرەوەكان لە كۆتاييەكانی جەنگی دووەمی جيهـانی، وەكوو: شـكـانـدنی ئـابلۆقەی (لينينگراد) و دابەزينی هێزە هاوپەيمانەكان لە نۆرماندی كە ناسـراوە بە (كرداری نيبتۆن - Operation Neptune). مێژووناسـان پێيان وايە شـكاندنی كۆدەكانی ئينيگما هۆكار بوو بۆ كورتكردنەوەی ماوەی جەنگی دووەمی جيهانی بۆ ماوەی زياتر لە دوو ساڵ و ڕزگاركردنی گيانی ١٤مليۆن كەس!

- سـەيرە، من هەرگيز لە پەرتووكەكانی مێژوو هيچ شـتێكم دەربارەی ئەم كردە نهێنييە نەخوێندووەتەوە!

- جێگای سەرسوڕمان نییە عبدالعزیز، چونکە دەزگای هەواڵگریی بەریتانی ئەم کردە نهێنییەی بۆ چەند دەیەیەك لە دوای جەنگی دووەمی جیهان شاردەوە و وردەکارییەکانی تا ئەم ساڵانەی دوایی ئاشکرا نەکرد.

- عبدالعزیز پرسیی: بەڵام بۆچی؟!

- بۆ ئەوەی هەمان کردە دووبارە بکاتەوە لە ئەگەری هەڵگیرسانی جەنگی سێیەمی جیهانیی چاوەڕوانکراودا!

- باشە، بەڵام پەیوەندیی ئەم بابەتە چییە بە نهێنیی ئاریۆس و سێوەکەوە؟!

- پرۆفیسۆر گوتی: هەموو ئەو هێمایانەی دایکی نیزال لە مەتەڵی سێوەکە بەکاری هێناون لە لوتکەی زیرەکیدان، لە هەمان کاتدا ئاماژە بە چەند شتێك دەکەن، هێمای سێوەکە ئاماژەیە بە ئیسحاق نیوتن کە یەکتاپەرست بووە، ئەمەش ئاماژەیەکی بەهێزە کە مەتەڵەکە پەیوەستە بە یەکتاپەرستان و، لە هەمان کاتیشدا ئاماژەیە بۆ (ئالان تورنج).

- عبدالعزیز پرسیی: ئەم کەسە کێیە؟

- (ئالان ماسیسۆن تورنج (Alan Mathison Turing) ڕابەری زانستی کۆمپیوتەر و زیرەکی دەستکرد، ئەو زانایەکی کۆمپیوتەری بەریتانی و بیرکاریزان و لۆژیکزان و زانای لێکدانەوەی کۆدەکان بوو، ڕۆڵێکی باڵای هەبوو لە بەرەوپێشبردنی زانستی کۆمپیوتەری نەزەری و، داهێنەری ئامێری تورنجە، کە دەتوانرێت بە

یەکەم کۆمپیوتەر دابنرێت لە مێژوودا. تورنج یەکێك بوو لە دیارترین ئەندامانی ئەو گرووپە نهێنییەی کە دەزگای سیخوڕیی بەریتانی پێکی هێنابوو بۆ شکاندنی کۆدی ئینگما، ئەم زانا بەریتانییە لە ساڵی ١٩٥٤ز خۆی کوشت لەڕێی خواردنی سێوێکی ژەهراویکراو بە گازی سیانیدەوە.

- سێو و کۆمپیوتەر؟! پرۆفیسۆر ئایە سێوە خوراوەکەی کۆمپانیای ئەپڵ (Apple)ی ئەمریکی کردوویەتیە دروشمی خۆی پەیوەندی بەم چیرۆکەوە هەیە؟

- پرۆفیسۆر بە زەردەخەنەوە ئاماژەی بۆ نیزال کرد و گوتی: پێم وایە هاوڕێکەت کە شارەزای هێماکانە دەتوانێت وەڵامی ئەم پرسیارەت بداتەوە.

- عبدالعزیز، کۆمەڵە بیردۆزێکی زۆر هەیە دەربارەی واتای دروشمەکەی ئەپڵ، یەکێك لەو بیردۆزانەش دەڵێت کە دروشمەکە ئاماژە دەکات بۆ ڕابەری زانستی کۆمپیوتەر ئالان تورنج، بەڵام ڕای پەسەند ئەوەیە کە سێوەکە ئاماژەیە بۆ نیوتن، ئەمەش لە یەکەم دروشمی کۆمپانیاکە لە ساڵی ١٩٧٦ز، بەئاشکرا دەردەکەوێت.

هێمای کۆمپانیای ئەپڵ لە ساڵی ١٩٧٦ز.




- کەواتە پیتی (X) کە لەسەر سێوەکە کێشراوە واتای چییە؟

- وەکوو پێم گوتی عبدالعزیز، وا دیارە هاوڕێکەت زیرەکییەکەی لە دایکیەوە بۆ ماوەتەوە، چونکە هەڵبژاردنی کۆدەکانی ئەم مەتەڵە لەلایەن ئەم خانمەوە لەوپەڕی زیرەکیدان. لەڕێگای کێشانی پیتی (X) لەسەر سێوەکە ئەم خانمە ئاماژە بەوە دەکات شتێکی نادیار هەیە پەیوەست بە سێوەکە، لە هەمان کاتدا ئەم پیتە ئاماژەیە بۆ باخچەی بلێچلی.

- ئەم باخچەیە چییە؟

- پرۆفیسۆر گوتی: (باخچەی بلێچلی ( Blechley park - باخچەیەکە لە شاری بلێچلی لە بەریتانیا، لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانی بنکەی سەرەکیی شکاندنی کۆدەکان بوو لە شانشینی یەکگرتوو، هەر لەم باخچەیەشدا کۆدە نهێنییەکانی ئینیگما شکێندران.




- عبدالعزيز گوتی: کەواتە پێویست بوو ئەو پیتەی ئاماژە بەم باخچەیە دەکات پیتی یەکەمی ناوی باخچەکە بێت کە پیتی (B) نەك پیتی. (X)

- نیزال گوتی: نـاوی هێمـای ئەم بـاخچەیە بریتییە لە وێستگەی X (X Station)

- کەواتە ئەم دەفرە قوپاوە چییە کە سێوەکەی تێدایە؟

- دەفری قوپاو ئاماژەیە بە لەخۆگرتن وەکوو پرۆفیسۆر پێشتر باسیکرد، بەڵام لەبیرت بێت هاوڕێ، ئێمە شتەکان بەو شێوەیە دەبینین کە ژیریمان دەیەوێت بیانبینێت، ئێمە ئەو شـێوەیەمان بە دەفری قوپاو بینی، چونکە ژیریمـان پێی ڕاگەیـانـدین کە ئەم لێکـدانەوەیە لێکدانەوەیەکی لۆژیکییە بۆ ئەو شـێوەیەی سـێوەکەی لەخۆ گرتبوو، بەڵام هەندێك کات پێویستە لە سنوورە تەسکەکانی لۆژیك ئازاد بین، تاوەکوو لە ئاســمانە فراوانەکەی خەیاڵ پەرواز بکەین، لەم ڕێگەیەوە شتانێك دەبینین کە پێشتر نەمان بینیوون!

- عبدالعزیز گوتی: بەتەواوی وەکوو منداڵان.

- ئافەرین هاوڕێ، بەتەواوی وەکوو منداڵان، منداڵان شتانێك دەبینن کە ئێمە نایان بینین و، ئەوان تێبینیی بچوکترین شت دەکەن، بەڵام ئێمە وانین، خەیاڵە فراوانەکەی منداڵ ڕێی پێدەدات شتەکان بە ڕێگای جیاواز ببینێت، ئەمەش وادەکات منداڵ زیاتر لە گەورەکان داهێنەر بێت لە بیرۆکەکانی. ئەگەر پرسیار لە پێگەیشتوویەك بکەیت دەربارەی ئەم شێوەیە ڕاستەوخۆ پێت دەڵێت کە دەفرێکی قوپاوە، بەڵام ئەگەر پرسیار لە منداڵێك بکەیت چەند ئەگەرێکت پێدەدات!

- عبدالعزیز گوتی: ئەمە واتا ئەم شێوەیە ئاماژەیە بۆ پیتی. U

- پرۆفیسۆر گوتی: (ئەلْترا( ultra - ، ئەو ناوەیە کە دەزگای سیخوڕیی سەربازیی بەریتانی نابووی لەو زانیارییانەی کە پێی دەگەیشت لەڕێگای شکاندنی کۆدەکانی ئینگمای نازییەوە، کە بوویە گەورەترین کۆکراوەی زانیاریی سیخوڕیی سەربازی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. بەریتانییەکان ئەو زانیارییانەی کە بە دەستیان دەگەیشت و نهێنی بوون پێیان دەگوت (زۆر نهێنی - (Most secret، بەڵام ئەو زانیارییانەی لە شکاندنی ئینیگما دەستیان کەوت لە هەر شتێکی تر نهێنیتر بوون بۆیە ناویان نا (ئەلْترا (Ultra - ، واتە سەروو یان هەرەبەرز، بە واتایەکی تر ئەم زانیارییانە پلەی نهێنیبوونیان لەسەرووی هەموو زانیارییە نهێنییەکانی ترەوە بوو!

- عبدالعزیز پرسیی: واتە پیت و ژمارەکانی خوارەوەی ئەم مەتەڵە زانیاریی نهێنین و بە زمانی ئینیگما نووسراون، بەڵام چۆن دەتوانین کۆدە ئاڵۆزەکانی ئەم زمانە بشکێنین؟

نیزال لێکۆڵینەوەکەی دایکی هێنا و پەڕەکانی هەڵدەدایەوە، پاشان گوتی:

- دایکم سەرەڕای لێکۆڵینەوە نووسراوەکەی بە زمانی عەرەبی، کۆمەڵێك بەڵگەنامەی بە زمانی ئینگلیزی لەگەڵ هاوپێچ کردووە، دوای ئەوەی پرۆفیسۆر لە پەیوەندییەکەی پێی گوتم کە هێماکانی مەتەڵی سێوەکە ئاماژەن بە کۆدەکانی ئینگما، پەڕەکانم هەڵدایەوە تاوەکوو پەیوەندیی ئەو هێمایانە و ئەنجامەکانی لێکۆڵینەوەکە بدۆزمەوە، پاشان بۆم دەرکەوت کە شکاندنی هەندێك لە کۆدەکان لە بەڵگەنامە نووسراوەکە بە زمانی ئینگلیزی نووسراون کە هاوپێچی لێکۆڵینەوەکەیە.

- پرۆفیسۆر گوتی: منیش لەوە دڵنیابووم بۆیە داوام لێکردی فایلەکە لەگەڵ خۆت بهێنی!

- عبدالعزیز پرسیی: نیزال، ئایە توانیت تەواوی کۆدەکان بشکێنی؟

- کارەکە پێویستی بە هەندێك کات و یارمەتیی کەسێکی ترە، بۆیە کارەکەم دواخست تا کاتی چاوپێکەوتنی پرۆفیسۆر.

- گەنجەکان چاوەڕێی چیدەکەن، دەی بەرەو کار! پرۆفیسۆر بەپەرۆشەوە هاواری کرد.

نیزال و پرۆفیسۆر کاریان دەکرد لەسەر شکاندنی کۆدەکان، لە کاتێکدا عبدالعزیز بەبێ دەنگی لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو، چاوەڕێی ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی دەکرد، بە تێپەڕبونی کات عبدالعزیز خەوێکی سووکی لێکەوت لەسەر کورسییەکەی، پێش ئەوەی بە هاواری پرۆفیسۆر بەئاگا بێتەوە:

- ماوەی ٥٠ ساڵە دڵنیام ئەمە ڕاستییە و ئەفسانە نییە!
- عبدالعزیز بەپەرۆشەوە گوتی: گەیشتنە هیچ ئەنجامێك؟ پێم بڵێن!
- بەڵێ، هاوڕێ، لە کۆتاییدا گەیشتینە نهێنیی ئاریۆس!
- ئەو نهێنییە چییە؟

نیزال هەناسەیەکی قوڵی هەڵمژی و گوتی:

- ئەوە گەورەترین گەنجینەیە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، گەنجینەی ئەفسانەیی ئاریۆسەکان، گەنجینەی ونی (ڤاندال)!

# سەرەتای جەنگەکە

خۆر لەسەر ئاوابوون بوو لە ئاسمانی شاری (یۆرك (York - ی باکووری بەریتانیا، لە کاتی گەیشتنی نیزال و عبدالعزیز، دوو هاورێکە ڕاستەوخۆ بەرەو شوێنێکی دیاریکراو بەرێ کەوتن لە ناوەڕاستی شارەکە، کاتێك لە ڕێگادا دەڕۆیشتن عبدالعزیز لە نیزالی پرسیی:

- تۆ دڵنیای لەوەی ئێمە بەرەو شوێنێکی ڕاست دەچین هاوڕێ؟

- ئەوە ئەو ناونیشانەیە کە دوێنێ شەو من و پرۆفیسۆر لە نامە کۆددارەکە پێی گەیشتین.

- هەر بەم بۆنەیەوە نیزال، ڕات چی بوو لەسەر ئەو پێشنیارەی پرۆفیسۆر پێی گوتی پێش ئەوەی کۆشکەکە جێ بهێڵین؟

- مەبەستت پەیوەندیکردنە بە کاترین و هاوکاریکردنی ئینتەرپوڵە بۆ دەستگیرکردنی تاوانباران؟

- بەڵێ، بیرۆکەکەت پێ چۆنە؟

- پێم وا نییە ئەوە بیرۆکەیەکی ڕاست بێت، چونکە زۆر باوەڕم بەم ڕێکخراوە نێودەوڵەتییانە نییە، زۆرێکیان لەژێرەوە کار بۆ بەرژەوەندیی ڕێکخراوە نهێنییەکان دەکەن، بەڵام بەهەرحاڵ دواتر بیر لەو بابەتە دەکەمەوە، لەوانەیە بەڵگەی تاوانەکانی چەتەکانی قدیس

یوحەننایان پێبدەم، تاوەکوو ئینتەرپوڵ سـەرقاڵی ئەوان بێت و ئێمەش خەریکی حەشاشییە تازەکان بین.

- پێت وایە پرۆفیسۆر بەم پێشنیارەی بیەوێت هەڵە کۆنەکەی ڕاست بکاتەوە؟

- عبدالعزیز، ئێستا کاتی زۆرمان لەبەردەست نییە بۆ قسەکردن لەسەر ئەم بابەتانە!

دوو هاوڕێکە بەردەوام بوون لە ڕۆیشتن تاوەکوو گەیشتنە کەنیسەیەکی گەورە، نیزال لەبەردەم کەنیسەکە وەستا و گوتی:

- هاوڕێ گەیشتینە کەنیسـەی (یۆرك مینسـتەر ( York Minster -، سێیەم گرنگترین کەنیسە لە بەریتانیا!



- بەڵام بۆچی بە دیاریکراوی ئەم کەنیسـەیە؟ پەیوەندیی گەنجینەی ونی ڤاندالەکان چییە بەم شوێنەوە؟!

- لەگەڵم وەرە عبدالعزیز، دەمەوێت شـــتێکت پیشـــان بدەم!
نیزال بەرەو لایەکی حەوشەی کەنیسەکە چوو، کە پەیکەرێکی برۆنزی گەورەی تێدا دانرابوو، نیزال ئاماژەی پێکرد و گوتی:
- پەیکەری ئیمپراتۆری ئاریۆسی یەکتاپەرست قوستەنتینی گەورە!



- بەڵام بۆچی پەیکەری ئیمپراتۆر قوستەنتین لێرەیە؟!
- لەم شوێنەدا بەدیاریکراوی و لە شاری یۆرکی بەریتانی، لە ساڵی ٣٠٦ز قوستەنتین کرایە ئیمپراتۆر، هەر لەم شوێنەدا ڕووداوی هەموو ئەو چیرۆکانە دەســـتیان پێکرد کە ئەو ماوەیە باســـمان کرد، چیرۆکی ئاریۆســـییە یەکتاپەرســـتەکان، کە ڤاندالەکان یەکێك لە ئـازاترین و بەجەرگترین نووســـەرەوەکـانی بوون، چیرۆکێك کە ئەم بکوژانە دەیانەوێت بۆ سەدان ساڵی تر بەشاراوەیی بمێنێتەوە.
- نیزال، تـا ئێســـتـا پێتوایە کە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم چەتە ترسناکانە بیرۆکەیەکی دروست بێت؟ باشتر نییە لەم خاڵەوە بوەستین؟
- لە ســـەرەتاوە پێم ڕاگەیاندی عبدالعزیز، تۆ ناچارنیت ئەم ڕێگایە لەگەڵ من ببڕیت، دایکت لە مەغریب پێویستی بە تۆیە.

- من باسی خۆم ناکەم، من تا کۆتاییی ئەم ڕێگایە لەگەڵتم، بەڵام بەزەییم بە تۆدا دێتەوە، ئەترسم ڕۆحی تۆڵەکردنەوە دڵت پڕ بکات و ڕاستییەکان نەبینی، تۆ ناتوانی ڕووبەڕووی ئەو گرووپە چەتە ترسناکە ببیتەوە!

- لەوانەیە ئەوان ترسناکبن، بەڵام عبدالعزیز دەزانی ترسناکترین دروستکراوی سەر ڕووی زەوی کێیە؟

- ئەو دروستکراوە کێیە؟

- ترسناکترین دروستکراوی سەر ڕووی زەوی مرۆڤێکە هیچ شتێکی نەمابێت لەدەستی بدات! ئەو تاوانبارانە لە منداڵیمەوە هەمووشتێکی جوانیان لێ زەوت کردم، تەنانەت تاکە زەردەخەنەی ژیانمیان لەناو برد، کاتێك پوری خۆشەویستمیان کوشت. بۆیە هیچ شتێکم نییە لەدەستی بدەم، کاتێك منداڵیش بووم ڕووبەڕووی جەنگێك بومەوە کە لەم جەنگە ترسناك نەبوو، ئەو کات خەریکبوو خۆم بەدەستەوە بدەم، بەڵام پوورم کاتێك بینیی بێهیوایی ڕویتێکردووم، قسەیەکی کرد کە ڕۆحی بەرەنگاری تیادا زیندوو کردەمەوە، کە خەریکبوو هەرەس بهێنێت.

- ئەو گوتەیە چی بوو؟

- مادام جەنگ بەسەرتدا سەپابێت ڕازی مەبە بەبێ سەرکەوتن لێی بێیتە دەرەوە!

- ئەمە واتە ئێمە بەرەو جەنگێکی ڕاستەقینە هەنگاو دەنێین؟!

- نەخێر، هاوڕێ، ئێمە ئێستا لە ناوەڕاستی ئەو جەنگەداین....

# بەرهەمەکانی ناوەندی ڕەها

| ژ | ناوی کتێب | ناوی نووسەر و وەرگێڕ |
| --- | --- | --- |
| ١ | ئیسلام یان ئیلحاد | ئەیاد نادر |
| ٢ | جوانتر بیربکەوە | سبحان سید |
| ٣ | دێڕی نامەکان | تەنیا محەمەد |
| ٤ | کچی کافرۆش | هێدی سەلیم |
| ٥ | هونەری جەنگ | ن: سون تزو<br>و: نیاز مەستی |
| ٦ | پیانۆ | محمد جمیل عەلی |
| ٧ | عاشقانە دێم | زامدار قادری |
| ٨ | چیرۆکی ڕەوشتە باڵاکان | محمد کەریم حاجی |
| ٩ | ئایا دەکرێت خوێن دروست بکرێت | ئەحمەد محەمەد نەقاش |
| ١٠ | ژیاننامەی زانایانی کورد | زانا قەرەداغی |
| ١١ | ستیڤ جۆبز کێ بوو؟ | ڕەوەند حەکیم |
| ١٢ | بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهان | ن: عائض القرنی<br>و: نیاز مەستی |
| ١٣ | پێشەوا زینو العابدین عەلی کوڕی حوسێن | عەبدولڕەحمان موحەممەد ئەمین |
| ١٤ | ماهی نوورین | هێدی سەلیم |
| ١٥ | ئەبولحەسەنی ئەشعەری قوتابخانە کەلامی و فەلسەفییەکەی | عەدنان ئەمین |
| ١٦ | ئەتەکێتی قسەکردن | ن: ئیهاب فکری<br>و: دەشنێ تالیب شوانی |
| ١٧ | ١٠١ کۆدی بەربەڕۆسا | ن: جیهاد الترباني<br>و: ئەحمەد حەمەئەمین مەنتک |
| ١٨ | فیقهی سانا | ئامادەکردن و وەرگێڕانی:<br>خ. ڕەشید ڕەحیم<br>نیاز مەستی |
| ١٩ | لابردنی گومانەکان لەسەر ئاهەنگگێڕان بە بۆنەی یادی لەدایکبوونی پێغەمبەرمان | م. جاسم کەرکووکی |
| ٢٠ | لا یآتیه الباطل | ن: موحەممەد ڕەمەزان بۆتانی<br>و: موحەممەد مەلا سعد الدین |
| ٢١ | ١٠١ چیرۆکی سەرسوڕهێنەر | ڕەوەند حەکیم |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٢ | ئامۆژگاری باوکێک بۆ ڕۆڵەکەی | ن: ئەشرەف عوسمان<br>و: ئەیاد فەهمی |
| ٢٣ | تاوانە دەروونییەکان | ن: موحەمەد ڕەمەزان البوطی<br>و: عومەر ڕێشاوی |
| ٢٤ | بەیانی جوانتر دەبێت | ن: عبدالله المغلوس<br>و: موحسین ئەمین |
| ٢٥ | گەورە بژی | ن: کەریم شازەلی<br>و: نێچیروان جاسم وەلی |
| ٢٦ | پەروەردەی ژیرانە | ن: کەریم شازەلی<br>و: هندرێن هەژار |
| ٢٧ | درەختی گەردوون<br>فێڵەکانی شەیتان | ن: محیدین ئیبن عەرەبی<br>و: یاد نوورسی - بوشرا خۆرانی |
| ٢٨ | ژیانەوەی دڵەکان | ن: ئەحمەد محمد سەعید |
| ٢٩ | ڕێبازێکی پەروەردەیی تاقانە | ن: محەمەد سەعید رمضان البوطی<br>و: م. عومەر ڕێشاوی |
| ٣٠ | بیرکردنەوەت بگۆڕە ژیانت بگۆڕە | ن: برایان ترێسی<br>و: داستان شەریف |
| ٣١ | خاڵ پێشچوونە زانکۆ | ن: یاسر عبدالکریم بکار<br>و: م. ڕەوەند حەکیم |
| ٣٢ | چیرۆکەکانی ژیان | ن: عەلی تەنتاوی<br>و: دیار ئیبراهیم سەنگەسەری |
| ٣٣ | زمانی دووەم | نەهرۆ جەرجیس |
| ٣٤ | سڵاوت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا | ن: موستەفا حوسنی<br>و: بەسام مەحمود |
| ٣٥ | فێربوونی فەرەنسی | بابان علی محمود |
| ٣٦ | فەرهەنگی دەرمان | ئەحمەد گوڵ |
| ٣٧ | کۆتا پیاوی ئەندەلووس | ن: ئەحمەد ئەمین<br>زامدار قادری |
| ٣٨ | لەگەڵ خەڵکدا | ن: عەلی تەنتاوی<br>و: ئەیاد فەهمی |
| ٣٩ | مرۆڤ و دادپەروەری خوا لە زەویدا | ن: محەمەد سەعید رمضان بوطی<br>و: عومەر ئەحمەد نیزامی |
| ٤٠ | نزاکانی مەولانا | ن: مەولانای ڕۆمی<br>و: کۆساران ئەحمەد |

رۆمان

- ئاریۆس کێ بوو؟ ئاریۆسییەکان کێ بوون؟
- مەبەست لە وشەی (الاريسيين) چییە لەو نامەیەدا کە پەیامبەر بۆ هیرەقلی نارد؟
- کۆنگرەی نیقیە چ ساڵێک بەسترا؟ کێ بوون ئەو کەسانەی بەشداربوون؟
- ئایە نیوتن یەکتاپەرست بوو؟ چیرۆکی سێوەکەی چی بوو؟
- چیرۆکی سەلمانی فارسی بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، لە کوێوە دەستی پێکرد؟
- ئیمپڕاتۆر قوستەنتینی گەورە بە چ شێوەیەک پاڵپشتی ئاریۆسییەکانی کرد؟
- کام سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا موسوڵمان بوو؟




بەرگ: محەمەد جەبار

1234567890

ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

هەولێر - بازاری ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
0750 406 66 74
Nawandi Raha - ناوەندی ڕەها